# پێنەواکان

# لەچوارچێوەی تاوانی ئەنفالدا





زەمان عەبدە

هەولێر
چاپی یەکەم
2016

# بیٚنەواکان
# لەچوارچیٚوەی تاوانی ئەنفالدا

زەمان عەبدە

zamanabda@yahoo.com
009647504489156

چاپی یەکەم
هەولێر :٢٠١٦

ناوی کتێب : (بێنەواکان) لەچوارچێوەی تاوانی ئەنفالدا

ناوی نوسەر : زەمان عەبدە

تایپ : نوسەر

نەخشەسازی بەرگ : فەرید شێوەزووری

نەخشەسازی ناوەوە : کۆمپیوتەری هیوا

چاپی یەکەم

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

چاپخانەی : رۆکسانا

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (٣٠٥)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە.

- پێـشکەشە بـە هـەموو ئەوکەسـانەی ڕۆژێ لـە ڕۆژان هاوکـاری و دڵنـەوایی تاقانـەکانی ئـەنفال و خـاوەن قوربانیەکانی ئەنفالیان کردووە .

- پێشکەشە بە پارێزەر (ئـەیاد ئیـسماعیل کاکـەیی) کـە هەمیـشە لەخـەمی تاقانــەکانی ئــەنفال و خـــاوەن قوربانیەکانی ئەنفالدایە و بەخۆبەخشی کارەکانیـان ڕادەپەڕێنێت لە داگاکان.

# پێرست

# پێشەکی

ئـەم کتێبــە بەرهــەمی ئـەو بەدواداچـوونانەمە، کـە لـە سـەرەتای نەوەتەکانــەوە شـانم داوەتــە بـەری، لـە چوارچـێوەی تـاوانی ئـەنفال، کەپێشتریش هەرلە سەردەمی پێشمەرگایەتی، لە کۆتایی هەشتاکانەوە، دوای ئەنجامدانی تاوانی ئەنفال،لـە لایـەن رژێمـی بەعـسەوە کاریگـەری زۆری لەسەرم هەبوو، بۆیە دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١ ئەم پرسە زیاتر چەکەرەی کرد لـەبیر و هزرمدا، هەرئەمـەش بـوو وایکرد، کە باقی ژیانی خۆم تەرخانبکـەم، لە پێناو پرسـی ئـەنفال، کە زامێکی قوڵە لەجەستەی میللەتەکەم، کاتێ بەرێکخراوەیی تێکەڵی ئەم کارە بووم، بەتایبەتی کاتی چـاوپێکەوتنم لەگــەڵ قوربانیــەکان و هەمووئەوانــەی لەگرتووخانــەی نوگرەســەلەمان و کـەمپی دووبـز و تـۆبزاوەو تکریـت و شـوینەکانی تـر رزگاریـان بووبـوو، یـان ئەوانـەی لەگۆرەبەکۆمەڵـەکان رزگاریـان بووبـوو و لەســەفەری مــەرگ گەرابوونــەوە دەکــرد، ئەوەنــدەی تــر ســوردەبووم لەکارەکـەم، کـە بەهـەموو توانامـەوە تـاکو ئیسـتاش شـانم داوەتـە بـەر، بـە خۆبەخـشی و چـاوەرێی هـیچ پاداشـتێکیش نـەبووم و ناشـبم، تـەنها دڵخۆشـکردنی خـاوەن قوربنیـەك ئەوپـەری دڵـی خۆشـکردوم و گـەرەترین مـەدالیای شـەرف بـووە بـۆم .ئـەم کـۆکراوەی دووتـوێی ئـەم کتێبـەش کـارێکی بەڵگەییـە (دیکۆمێنتـاری) بـۆ ئـەوەی لـە هـزری نـەوەکانی

داهاتوومان چەکەرەبکات و وەکو میژوویەکی زیندوو بمێنیتەوە وکاری لەسەربکرێت، لەریگای ئەقل و زانستەوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر (کۆمەڵکوژی) گەلی کورد ئەنجامنەدرێتەوە، هەرتاکێکی کوردیش گەر رۆژێك دەسەلآتی هەبوو، نەفرەت لەم تاوانە نەگریسەبکات و وابەستەی ئاشتی و پاراستنی مافی مرۆڤ بێت.خوێنەری بەرێز لێرەدا تەنها تیشکم خستۆتە سەر تاقانەکانی ئەنفال کە لەپێناسەکەدا زیاتر ئاشنا دەبی بە تاقانەی ئەنفال کەتاقانەی ئەنفال کێیەو ئەوان کێن؟هەرچەندە ئێمەی کورد تاوانی زۆرلە دژی میللەتەکەمان ئەنجامدراوە لەرابردودا،چونکە هەموو ئەو کەسانەی دەسەلآتیان لە چوارچێوەی دەولەتی ئێراق، گرتۆتەدەست بەفکروئایدۆلۆجیایەکی شۆڤێنی عەرەبی مامەلەیان لەگەلْ گەلی کورد و دۆزەکەی کردووە، رەنگە لەچوارچێوەی ئەوتاوانانەش کەسی تر هەبیْ لە خێزانەکەی بەجێمابیْ بەتەنها، ئەوەی کە زیاتر زانیاریم لەسەری هەبیْ تاقانەکانی تاوانی کیمیابارانکردنی شاری (هەڵەبجە) یە کە بەپێی زانیاری من ژمارەیان ( ٣٠) کەسە کەچاوپێکەوتنم لەگەلْ هەندیکیان کردووە، خوایاربێت لە داهاتوودا کتێبێکی تایبەت بە تاقانەکانی کیمیابارانی (هەڵەبجە) دەنوسمەوە دوای تەواو بوونی کارەمەیدانیەکان، بۆئەم کارانەش تەنها پشتم بەتوانای خۆم بەستووەکە هیوادارم لەداهاتوودا حکومەت و دەزگا تایبەتمەندەکان، بیرلەم بابەتەگرنگانە بکەنەوە و هاوکاربن، چونکە ئەم بابەتانە پەیوەندی بەهەمووتاکێکی کورد و هەموومرۆڤ دۆستێکەوە هەیەنەخاسما حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەسەلآتەکەی کەدەبوو بانکێکی زانیاری لەسەر ئەم تاوانانە دروستبکردایە لە چوارچێوەی دەزگایەك و پاراستنی بەڵگەنامەکان.

بۆ ئەم کتیبەش تەنها ئاماری تاقانەکانی ئەنفال وچاوپێکەتنی هەندێکیانم داگرتووە وەك نموونەیەك لەچیرۆك و ژیانی هەموو تاقانەکانی ئەنفال، گێرانەوەی چیرۆك و بەسەرهاتی هەریەکێ لەتاقانەکانی ئەنفال، تراژیدیایەکی جەرگ بڕەو جێگای خۆیەتی کە هونەر مەندانی سینەمایی لەم شاکارانە کەڵك وەربگرن و پێشبرکێ بکەن بۆ دروستکردنی دەیان فلمی سینەمایی و وەربگێردرێنە سەر زمانەکانی تر،کە دڵنیام ئەم کارەیان دەبێتە خزمەتێکی گەورە بۆ دۆزی رەوای گەلی کورد و ناساندنی مەزڵومیەتی گەلی کورد .بۆ ئەم کارانەشم پشتدەبەستم بەخواو توانای ماددی و جەستەیی خۆم، بەدڵنیایەوە کەسانی تریش هەن لەم ولأتە کاروخزمەت بەم دۆزەدەکەن دەستخۆشیان لێدەکەم، هیوادارم بەم کارەم خزمەتێکی بچوکم بەدۆزی ڕەوای گەلەکەم کردبێت و هیوادارم هیچ گەلێکی سەر ڕووی زەوی دووچاری ئەم نەهامەتیەیانە نەبێت کە گەلی کورد بەسەری هاتووە.

**نووسەر**

# وتەیەکی پێویست

## وتەیەکی پێویستی پەیمانگای (گەشە) کە ئەرکی بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبەی لەخۆگرتووە

پەیمانگەی گەشەی ناحکومی لەساڵی ٢٠١٤ دامەزراوە ، پێشەنگیو دڵنیایی لە کوالیتی خوێندن سەرەکیترین مەبەستی دروستبوونی پەیمانگەیە. ئەم پەیمانگەیە هەرسێ بەشی نەوتو کۆمپیوتەرو هەروەها کارگێڕیو ژمێریاری لەخۆدەگرێت، کە پڕۆگرامەکانی خوێندنی بەباشترین شێوە داڕێژراونو هەموو هۆکارەکانی خوێندنیشی بۆ ئامادەکراوە لەڕێگەی نوێترین تەکنۆلۆژیای سەردەم.

لە پەیمانگەی گەشە خوێندن لە هەموو بەشەکان بە زمانی ئینگلیزییە، ئەمەش لەبەر گرنگی ئەم زمانەیە لە هەرسێ بەشی ئاماژەپێکراو، کە دەبێتە یارمەتیدەرێکی زۆر باش بۆ فەراهەمکردنی هەلی کار بۆ دەرچووانی پەیمانگەکە. بۆ ئەم مەبەستەش بابەتی زمانی ئینگلیزی بەچڕی دەخوێندرێت کە بریتییە لە (٨) کاتژمێر لە

هەفتەیەکدا، ئەمە جگە لەوەی کە هەموو بابەتەکانی تریش بە زمانی ئینگلیزی دەخوێندرێت. هەروەها بە پێچەوانەی شێوازە سادەکەی وتنەوەی وانەی زمانی ئینگلیزی، بەشی تایبەت بەم زمانە لە پەیمانگەی گەشە جەختی کردووە لەسەر چوار بنەماکەی زمان کە بریتین لە ئاخاوتن و گوێگرتن و نووسین و خوێندنەوە.

لەگەڵ بایەخی تەواو بە بواری پەروەردەیی و زانستی، پەیمانگەی گەشە گرنگی دەدات بە بوارەکانی گەشەپێدانی مرۆیی و بەرزکردنەوەی تواناکان بۆ ستافی پەیمانگەو قوتابیان لەرێگەی کردنەوەی خولی راهێنان و سمینارو وێرکشۆپە فرەبابەتییەکان. هەروەها گرنگیدان بە چالاکییە کۆمەڵایەتی و زانستییەکان بوونەتە بەشێکی گرنگی چالاکییەکانی پەیمانگە لەرێگەی رێکخستنی ئاهەنگی یەکترناسین و فستیڤاڵ و کێبڕکێی سەرنجراکێشەوە.

لەبەرگرنگی کتێبی (بێنەواکان لە چوارچێوەی تاوانی ئەنفالدا) بریارماند ئەرکی چاپکردنی لە ئەستۆبگرین کە لەنوسین و بەدواداچونی بەرێز (زەمان عەبدە) نوسەروشارەزا لەپرسی ئەنفال و جینۆسایدە، چونکە لە روی بە بەڵگەییکردنی تاوانی ئەنفال ناوەرۆکی کتێبەکە کارێکی دیکۆمینتاری بەهێزە سەبارەت بەتاوانی ئەنفال و مەزلومیەتی گەلی کورد،لە هەمانکات ئەرکی هەرتاکێکی کوردە لە هەربوارێك بۆی رەخسا خزمەت بەنەتوەکەی بکات، ئەمەش خزمەتێکە ئێمە لەئەستۆمانگرد کە پێمانوایە دلۆپێکە لەدەریایەك، هیوادارین توانیبێتمان خزمەتێکی بچوکی نەتەوەییمانکردبێت لە بواری رۆشنبیری و ئەدەبی بەخوێنەران و لێکۆڵەروانان و شارەزایان لە بواری سینەماو هەموو ئەوانەی دەیانەوێت مێژوی قوربانیدان و مەزلومیەتی گەلی کورد

بزانن. ئەگەر لەروی سینەماو فلیم سازیەوە سەرنجی ناوەرۆکی ئەم کتێبە بدەین چەندین چیرۆکی راستەقینەی تێدایە کەدەکرێت دەرهینەرو هونەرمەندان کاری جدی لەسەربکەن، چونکە سینەما و فلمەکان کارێکی گرنگن بۆ ناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد لەچوارچێوەی تاوانی ئەنفال، هەروەها هیواداریین لەداهاتودا ئەم کتێبە وەربگێردرێتە سەر زمانەکانی تر بەتایبەتی زمانی (ئینگلیزی – عەرەبی– فەرەنسی – ئەلمانی) ، لەهەمانکات خوازیارین ئەم کتێبە تەژی لە داهات بێت بۆ ئەوەی نوسەر بتوانیّ لەم کارانەی دانەبڕێت بۆ خزمەتکردنی دۆزی ئەنفال و جینۆسایدی کورد و ناساندنی ئەو تاوانانەی لەسەردەستی رژێمی بەعس ئەنجامدرا لە ماوەی ٣٥ ساڵی حوکمرانی، تاکو ئەودەمەی پەردە لەسەر هەمووتاوانەکان لادەدرێت. بەهیوای سەرکەوتن بۆ نوسەری بەریز و کاری باشتر و بەردەوام.

**شاخەوان تەلعەت رەحمان**
**بەرێوەبەری پەیمانگای گەشە**
**بەکالۆریۆس لەئەندازیاری**
**ماستەر لە کارگێری کار**

# تاوانی ئەنفال

تـاوانی ئـەنفال کـە لـە سـالآنی ١٩٨٧_ ١٩٨٨ لەلایـەن رژێمـی بەعـسەوە پیادەکرا دژی گەلی کورد، زۆر گشتگیر و فراوان بوو، بەجۆریك سەرتاسەری کوردسـتانی گرتەوە،سـەرەتای دەسـتپێکی ئـەم تاوانـە لەبـەهاری ١٩٨٧ وە دەسـتی پێکـرد، بەڕوخانـدنی گونـدە نزیکدەسـتەکان، هەرچـەندە پێـشتریش پرۆسەی روخاندنی گوندەکان هەر هەبووە لێرەو لەوێ بەتایبەتی لە پارێزگای کـەرکوك، بـەبیانوی پـشتێنەی ئـەمنی و پاراسـتنی بـیرە نـەوت و کۆمپانیـا نەوتیـەکان بەتایبـەتی سـالآنی ١٩٦٣ و ١٩٧٥ و ١٩٨٦ کـە سـالّی ١٩٨٦ سەرجەم گوندەکانی ناوچەی سالّەیی لەناحیـەی پـردی و شـوان و شێخ بزێنی خـاپورکران و دانیـشتوانەکەی لـە دەوروبـەری شـاری هـەولێر کۆکرانـەوە، لـە ژیـانێکی پـڕ ناخۆشـی و بێخزمـەتگوزاری و پەکخـستنی توانامرۆییـەکان و بێکاری، جگە لەو ناوچانە، هەر لەم سالّەدا زۆربەی گونـدەکانی بازنـەی شـاری کـەرکوك هـاو چـارەنووس بـوون . بـەلآم ئـەوەی کـە لـە بـەهاری ١٩٨٧ ڕویـدا بەڕوخانی گونـدەکان و دەسگیرکردنی گوندنـشینان، دواتـر دەرکـەوت کـە ئەمـە سـەرەتایەك بـوو بـۆ پیـادەکردنی تـاوانی ئـەنفال، دوای ئـەم قۆناغـە پـەلامارە گەورەکـەی ئـەنفال دەسـتی پێکـرد کـە ئەمـەیان بـۆ سوپای رژێم ئاسـان نـەبوو، بەحوکمی ئـەوەی ئەوناوچـانەی مـابوون زۆربـەی شـاخاوی و گردۆلکـاوی بـوون و رێگای هاتووچۆی ئۆتۆمبێلی نەبوو یان بە زەحمـەت ئۆتـۆمبێلی بـۆ دەچـوو، جگـە لـەم ئاسـتەنگانە زۆربـەی ئەوناوچـانە هێـزی پێـشمەرگەی کوردسـتانی لێبـوو، کـە ئـەم هێزانـە لـە چوارچێوەی شۆڕشـی کـورد بـەرگریان لەناسـنامەی میللـەتی کـورد دەکـر . بـەلآم رژێـم بـە تـەواوی خـۆی بـۆ ئـەم پەلامارانـە

ئامادەکردبوو بە هێزی سەربازی و هەموو پێداویستیەکانی جەنگ بەتایبەتی ئامادەکاری کردبوو بۆ بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوی کیمیاوی و کردنەوەی رێگاکان، ئەوەبوو لەشەوی ٢٢لەسەر ٢٣ی شوباتی ١٩٨٨ لەهەموولایەکەوە پەلاماری ئەنفالی یەك لە ناوچەی قەزای دوکان و دۆڵی جافایەتی دەستی پێکرد کە ئەوکات بارەگای سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگوندی سەرگەڵ وبوو بەچڕی کەوتە بەردەم ئەم شاڵاوەو بەکارهێنانی چەکی کیمیاویش لەلایەن سوپای ئێراقەوە هۆکاێکی گەورەبوو بۆکۆنترۆڵکردنی ناوچەکە چونکە خەڵکی ناوچەکە هیچ زانیارییەکیان نەبوو لەسەر چەکی کیمیاوی و چۆنیەتی خۆپاراستن لێی و هیچ کەرەستەیەکی خۆپاراستن لە چەکی کیمیاوی بوونی نەبوو،بەدرێژایی پەلامارەکانی ئەنفال لەکوردستان بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی بوونی هەبووکە زیاتر لە ٣٥ شوێن بەکارهات، جگە لەشاری هەڵەبجە کە زۆرترین قوربانی لێکەوتەوە، بەم شێوەیە بە هەشت قۆناغ سەرتاسەری کوردستان کەوتە بەرشاڵاوی ئەنفال .کە قۆناغی هەشت لەناوچەی بادینان کۆتایی هات لەرۆژی ١٩٨٨/٩/٦، لە ئەنجامی ئەم تاوانە سەرجەم ئەو گوندانەی مابوون تەخت و خاپوورکران و ژیانیان تیاسرایەوە، بەهۆی ئەوەی سەرجەم سەرچاوەی ئاوەکان کوێرکرانەوە و ژینگەی ناوچەکەش بەهۆی بەکارهێنانی چەکی کیماویەوە پیس بوو، جگە لەمانەش رژێم هەموو جوڵەیەکی لەم ناوچانە خستبووە ژێر چاودێرییەکی چڕوە بەجۆرێك ئاژەڵیشی بەدی بکردایە لەناوی دەبرد، نەك هەرمرۆڤ، سەرئەنجام (١٨٢٠٠٠) مرۆڤی کورد لە هەردوو رەگەز و بەهەموو تەمەنەکانەوە شوێنبزرکران،دواتر ساڵی ٢٠٠٣ دوای پرۆسەی ئازادی گەلانی ئێراق لە چنگی رژێمی بەعس لەسەردەستی هاوپەیمانەکان، بەسەرۆکایەتی ئەمریکا، هەندێك لەقوربانیەکان لەگۆڕە بەکۆمەڵەکان دۆزرانەوە. لەچوارچێوەی تاوانی ئەنفال کە ناوی سورەتێکی

قورشانی پیرۆزە ودژی میللەتی کوردی موسڵمان ئەنجامدرا، کەهەموو تاوانەکانی لە خۆگرتبوو وەك (بۆمبابارانکردنی گوندەکان بە چەکی کیمیاوی وخەردەل وهی تر ، کوشتن بەبێ دادگاییکردن، روخانی گوند و کوێرکردنەوەی سەرچاوەکانی ئاو . سوتاندنی بەروبومی کشتوکاڵی و رەز و باخەکان، کۆکردنەوەی گوندنشینەکان بە هەمووتەمەنەکانەوە و جیاکردنەوەی گەنج و پیر و ژن و پیاو و دایك و منداڵ، برسی و تینوکردن، ئابڕو بردنی ئافرەتان . راپیچکردنی قوربانیەکان بۆ ناو گۆرە بەکۆمەڵەکان و گولەبارانکردن و زیندە بەچاڵکردنیان . هتد...

ئەم تاوانانەش بە پێیی یاسای دادگای باڵای تاوانەکان لەئێراق، کەتابعی یاسای نیودەوڵەتیە لەمادەکانی ١١و١٢و١٣ خۆیان دەبیننەوە کە تاوانەکانی (کۆمەڵکوژی و جینۆساید ـ تاوانی جەنگ- تاوانی دژە مرۆیی) یە کە دواترلە٢٠٠٧/٦/٢٤ دادگای باڵای تاوانەکان بەم ٣ ماددەیە، پشتراستی تاوانەکانی کردەوەو بڕیاری لەسەردا کە بەدرێژایی ٦١ دانیشتن گەیشتە ئەم بڕیارە بە پشتبەستن بە بەڵگەنامەکان کە لەبەردەست بوون.

تاوانی ئەنفال گورزێکی گورچك بڕبوو کە بەعس، لە کۆمەڵگای کوردی سرەواند بە جۆرێك خێزانەکانی لەبەر یەك هەڵوەشاندەوەو ئەوانەی دوای تاوانی ئەنفال مانەوە تاکو ئیستاش لە باری دەرونی سەختدا ژیان بەسەردەبەن، بەتایبەتی ئەومنداڵانەی کە لەخێزانەکانیان دابڕان بەتەنها مانەوە کەپێیان دەوترێت تاقانەی ئەنفال، لێرەدا بۆیە زیاتر قسە لەسەر تاقانەی ئەنفال دەکەین، چونکە ئەم کتیبە تایبەتە بە تاقانەکانی ئەنفال کەدواتر لەسەر زاری هەندێکیان سەرگوزەشتەی ژیانیان دەخەینە بەردیدی خوینەرانی بەریز. تاقانەکانی ئەنفال زۆربەی زۆریان لە تەمەنی منداڵیدا لەخێزانەکانیان دابڕاون بۆیە ژیانی هەریەکێ لەم تاقانانە تراژیدیایەکی جەرگ بڕە، بە جۆرێك مرۆڤ ناتوانێ لە ئاستی گێڕانەوەیاندا نەداتە قوڵپەی گریان،

چونکه لە کاتی تاوانی ئەنفال حکومەتی بەعس جاڕیداوە بەناو خەڵکدا ئەگەر هەرکەسێك ڕزگاربوویەکی ئەنفال، لەماڵەکەی دەسگیر بکرێت، ئەوا بەخێزانەوە دەستگیر دەکرێن و ئاراستەی هەمان چارەنوس دەکرێن، بۆیە تەنانەت خزم وکەسەکانی خۆشیان نەیانتوانیوە داڵدەی یەکتر بدەن، بەمەش ئەو منداڵانە ڕوو بە ڕوویی چارەنووسێکی رەش هاتوون، بەم حاڵە شەوە تاقانەکانی ئەنفال، توانیان خۆیان بگەێننە ئەمرۆ کە ئێستا زۆربەیان ژیانی هاوسەریان پێکهیناوە و خێزانیان دروست کردووە، دوای ئەوەی حکومەتی هەرێم لەرێی وەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکانەوە مووچە و هەندێ دەستکەوتی بۆ فەراهەمکردون، هەرچەندە لەئاستی پێویستدا نیە .

ئەوانەی لە دوای تاوانی ئەنفال، بەتەنها لەخیزانەکانیان دابڕان جگە لە تاقانەکانی ئەنفال کە لەخوار تەمەنی ١٨ساڵی بوون، کەسانی تریش هەن لە ژن و پیاو کە لەخێزانەکانیان دابڕاون، بەلأم ئەوانە براو خوشك یان باوك و دایکیان هەبووە بەلأم تاقانەکانی ئەنفال ئەوانەی لێرەدا قسەیان لەسەردەکەین هیچ کەسیان نەماوە لەخێزانەکانیان وەك باوك و دایك و برا و خوشك کە دواتر لە پێناسەی تاقانەی ئەنفال دیاریان دەکەین کە لەگەل تاقانەکان خۆیان رێککەوتین لەسەر ئەو پێناسەیە.

تاقانەکانی ئەنفال بە پێی هەشت قۆناغەکەی ئەنفال دابەش بوون بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستان بەلأم زۆرترینیان لە ناوچەی گەرمیانن و کەمترینیان لە بادینان تەنها لە شاری دهۆك کچێك و دووکوڕ بەئاین مەسیحی هەیە کە بەتەنها لە خیزانەکەیان دابڕاون لە تەمەنی خوار (١٨) ساڵان .

# ئەنفال لەڕووی زمانەوانییەوە

بۆقسەکردن لەسەر پرسی (ئەنفال) پێویستە ئەم پێناسەیەی خوارەوە بنوسینەوە چونکە وشەی ئەنفال جگە لەقورئانی پیرۆز لە ناو ئەدەبیات بونی نیە، بۆیە دەبێ پێش هەمووشت خوێنەر لەوشەی (ئەنفال) تێبگات و زانیاری هەبێت لەو بارەوە، بەتایبەتی ئەوانەی موسڵمان نین، لەبەر ئەوەی لەکاتێکا سەدام و دەوڵەتەکەی خۆیان بەموسڵمان دەزانن، چۆن دەکرێت بۆ قڕکردنی گەلێکی موسڵمانی وەکو کورد ئەو وشەیە بەکاربێنن، ئەمە پرسیارێکە نەك لەلای ئەوانەی موسڵمان نین بەڵکو لەلای زۆرینەی موسڵمانانیش بوونی هەیە، چونکە لەشاشەی تەلەفزیۆنەکان، سەدام دەبینرا پێناسەی خۆی بە موسڵمان دەکرد و لەبەردەم کامێراکان نوێژی دەکرد و سەردانی ماڵی خواشی دەکرد، زۆر جاریش دەردەکەوت شمشێرێکی دەگرتەدەستەوە، وەکو ئەمیری موسڵمانانی سەردەمی سەرهەڵدانی سەرەتای دینی ئیسلام .

کردەوەکانی سەدام لەبەردەم کامیراکان جگە لە خۆڵکردنە چاوی موسڵمانان هیچی تر نەبوو، چونکە لەپشت چاوی کامیراکان هەزاران تاوانی ئەنجامدەدا دژی مرۆڤایەتی کە ئەم تاوانانە هەمووی بە بەڵگەی سەلمێنراو پشتراستکراوەتەوە لەداگای باڵای تاوانەکان، بە ئامادەبوونی خودی سەدام و هاوکارەکانی، کە لەکاتی نیشاندانی بەڵگەکان تەنها سەریان شۆردەکرد، بێئەوەی شەرمەزاربن، وەکو ئەوەی بڵێن کورد تەنها شایانی کوشتنە، تەنانەت عەلی حەسەن مەجید لە دانیشتنی ژمارە ٣٥ی دادگای ئەنفال، کاتێ کاسیتە تۆمارکراوەکانی لێدرا، نەیتوانی هیچ نکوڵی بکات و وتی: ئێستاش ئامادەم ئەوکارانەبکەمەوە .

لەکاتێکا ئەم تاوانانە، لە دژی گەلی کوردی موسڵمان ئەنجام دەدرا کە

هەموو گوندێکی کوردستان ئەگەر حەوت ماڵ بوو بێت هەشتەمینی مزگەوت بووە، بۆ خواپەرستی و پڕبووە لە قورئانی پیرۆز و کتێبە ئاینیەکانی ئیسلام، کەسەدام و ڕژێمەکەی گشت ئەو مزگەوتانەیان روخاندو تەنانەت هەموو قورئان و کتێبە ئاینیەکان سوتان و یان کەوتنە ژێرخاك و پەردوی مزگەوتەکانەوە، کە زۆرێك لەوشایەتحاڵانەی لە تاوانی ئەنفال ڕزگاریان بووە، دەڵێن بەچاوی خۆمان بینیمان قورئان لەنێو بڵێسەی ئاگردا دەسوتا بەبەرچاوی ئەفسەروسەربازەکانەوە.لەکاتێکا زۆر ترین زانای ئاینی ئیسلامیش هەر لەناو کورد بوون بەئێستاشەوە کە زانا عەرەبەکان خۆیان گەواهیی ئەو راستیەدەدەن.

بەرای من سەدام گەورەترین سوکایەتی بە ئیسلام کرد، کاتێ بۆ قڕکردنی کورد وشەی (ئەنفال) ی بەکار هێنا، کەدەبوو هەموو موسڵمانانی دونیا، لەم بێرێزیەی سەدام ورژێمەکەی بێدەنگ نەبن کە بەناوی ئایەتێکی قورئانی پیرۆزەوە گەلێکی موسڵمان قڕبکرێت، بەگەورەوبچوکەوە وبەبێ هیچ تاوانێك وبێئەوەی تێپەڕبن بەهیچ قۆناغێك لەلێکۆڵینەوەکانی دادگاکان .سەدام پێی وابوو بە بەکارهێنانی وشەی (ئەنفال) پشتیوانی بۆ خۆی پەیدادەکات، لەلایەن دەوڵەتانی عەرەبی و ئیسلامی کە هەرواش دەرچوو چونکە هەموو ئەو وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیانە بەرژەوەندیان لەگەڵ سەدام و ڕژێمەکەی هەبوو، بەرژەوەندیەکانیش، هەندێکیان قەومی بوو هەندێکیان ماددی بوون، تاکو ئیستاش هەندێ لە عەرەبە شۆڤێنیەکان، سەدام بە شەهید و بە قارەمان ناو دەبەن، لەکاتێکا ئەو قارەمانە دەستی لە خوێنی سەدان هەزار مرۆڤی کوردو عەرەب و نەتەوەکانی تری ئێراقەهەبوو، تەنانەت بۆمانەوەی دەسەڵاتی خۆی، دەستی لە کەسە زۆر نزیکەکانی خۆشی نەپاراستووە. نموونەیەکی زیندوو لەو وڵاتانەی لەماوەی جەنگی ئێراق ئێران، هاوکاری ئێراقی دەکرد ئەویش وڵاتی کوێت بوو، هەرلە سەردەمی تاوانی ئەنفال لەو وڵاتە کۆنگرەی وڵاتانی

ئیسلامی بەسترا،کەچی یەك وشەیان باسنەکرد لەهەمبەر ئەوتاوانانەی بەناوی ئەنفالـەوە لـە دژی گـەلی کـوردی موسـڵمان ئەنجامـدەدرا لەکوردسـتان، بـەڵام کاتێـك نۆرەگەیـشتە سـەر وڵاتـی کوێـت و سـوپاکەی سـەدام سـاڵی ١٩٩٠ پەلاماری کوێتیدا و تەڕو وشکی ئەو وڵاتـەیان بەیەکەوە سوتاندو داگیریـانکرد ئینجـا دڕنـدەیی سـەدام و ڕژێمەکـەیان ناسـی، کـە وڵاتـی کوێتیـان تـاڵانکردو تەنانەت دەستدرێژی سێکسیان کردە سەرکچان و ژنانی ئەو وڵاتە و (٦٠٠) کەسـیش لەکوێتیـەکان گوازرانـەوە بـۆ ئێـراق دواتـر شـوێنبزرکران کـە مـن خـۆم شایەتی ئەوە دەدەم، کە لەساڵی ١٩٩١ لەکەرکوك دەسگیرکرام و دوای ١٧ ڕۆژ زیندانی لە گرتووخانەی کەمپی تۆپزاوەو تکریت خۆم لـە سـەربازگەی ڕومـادی بینیـەوە کـە جێـی زینـدانی دیلـەکانی ئێـران بـوو، بـە پێیـی ئـەو نوسـین و تابلۆیانەی لەسەر دیوارەکـان هـەبوون، دوای ئـەوانیش کوێتیەکانیان بردبووە ئـەوێ، کـاتێ ئێمەشـیان بـردە ئـەو شـوێنە نوسـینێکی زۆرم بـینی بـەزمانی عـــەرەبی نوســـرابوو لەســـەردیوارەکان وەکـــو نـــاوی ســـیانی کوێتیـــەکان و ناونیشانیان لەکوێت و ناوی منداڵ و کەسوکاریان و زۆر شتی تریش، سەرەتا لەسەرکارتۆنی پاکەتی جگەرە ئەوناوانەم تۆماردەکرد، زۆرم کۆکردبوەوە بەڵام ڕۆژێکیـان وتیـان پـشکنینی هـۆڵی زیندانیـەکان دەکـەن، بۆیـە ترسـام پێمبگـرن بۆیە لەکاتی چونمان بۆ تەوالێت خستمنە ناو بیری تەواڵێتەکەوە، چونکە ئەگەر ئەوەیان پێمبگرتایە دەیانزانی من کەسێکی سیاسیم و بەدڵنیاییـەوە ئازاریـان دەدام هەرچەندە هەمووومان چانسی ئەوەمان نـەبوو جارێکی تـر ڕزگارمـان بێـت بـەڵام دواتـر لـە دانوسـاندکان لـەنێوان ڕژێـم و سـەرکردایەتی کـورد داوای ئازادکرنمان کرابوو.

# ئەنفال كۆی وشەی (نفل) ە (نفل) یش واتە (الغنیمە) بە كوردی واتای دەستكەوتە.

( ئەنفال وەكو زاراوەیەكی قورئانی پیرۆز )

ئەنفال لە ئایەتی ژمارە (١) ی سورەتی (الانفال) دا هاتووە كە دەفەرمێت :

بسم الله الرحمن الرحیم

(یسالونك عن الانفال قل الانفال لله والرسول)

ئەم زاراوەیەش بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسە كراوە :

(هی الاموال الماخوذة من الكفار قهرا لقتال) .

لەم ڕوانگەیەوە سێ ئەنجاممان دەستدەكەوێت :

ئەنفال (اموال) ە واتە شتومەك هەروەكو لە هەمان سورەتی (الانفال) دا خوای گەورە پێناسەی بەئایەتی (واعلموا انما غنمتم شئ) كردووە چونكە (شئ) بەشتومەك یان شت دەوترێ.

(من الكفار) : واتە لە بێباوەرانی جەنگاوەر.

(قهرا بقتال) : شتومەكەكان یان دەستكەوتەكان شتی بەجێماوی گۆرەپانی جەنگە نەك ماڵ و نێو ماڵی لادێ و شارەكان، ئەو شتومەكانەی گۆرەپانی جەنگیش پێی دەگوترێ (غنیمە) . كەوابێ دەستكەوت لە ئاینی ئیسلام و ئاینەكانی پێشوش ڕێگە بەكەس نەدراوە هەڵیانبگرێتەوە.

هۆكاری نازڵبونی سورەتی ئەنفالیش، لە ئەنجامی بە دەستهێنانی ئەو دەستكەوتە زۆرەوە بوو كە لە شەڕی (بەدر) دا لەڕۆژی (١٣ی مارسی ساڵی ٦٢٤/) ی زایینی بەرامبەر بە (١٧) ی (ڕەمەزان) موسڵمانەكان وەدەستیان هێنا، پاشان ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە، موسڵمانەكان بون بە سێ بەشەوە،

بەشێکیان دەیان ووت ئێمە دوژمنمان ڕاوناوە دەبێ دەستکەوتەکان بۆ ئێمە بێت بەشی دووەمیان دەیان ووت ئێمە شتومەکەکانمان کۆ کردۆتەوە دەبێت بۆ ئێمە بێت، بەشی سێیەمیان دەیان ووت لەکاتی جەنگەکەدا ئێمە پارێزگاریمان لە پێغەمبەر (د.خ) کردووە بۆیە دەبێ بۆ ئێمەبێت.

دواتر دەستکەوتەکان بەیەکسانی دابەشکرا بەسەر جەنگاوەرانی موسڵمانان .

# پێناسەی تاقانەی ئەنفال

تاقانەی ئەنفال، ئەو کەسەیە کە لەکاتی پیادەکردنی تاوانی ئەنفال لە دژی گەلی کورد، لە باشوری کوردستان لە سالآنی ١٩٨٧ – ١٩٨٨ بەتایبەتی، لە هەر هەشت قۆناغەکەی ئەنفال کە لە مانگی شوباتی ١٩٨٨ وە دەستی پێکردو لە لەمانگی ئەیلولی ١٩٨٨ کۆتایی هات، کە سەرجەم خێزانەکەی لە پرۆسەی تاوانی ئەنفال شوێنبزرکرابن وەك (دایك – باوك – خوشك – برا) و بەتەنها لە تەمنێکی منداڵی خوار (١٨) یان (٢٠) ساڵی مایەوە بێ ئەوەی ماڵ و شوینێکی هەبیت بۆ ژیان.

* * * * *

ئەمەی سەرەوە جۆری یەکەمی تاقانەیە کە ئێمە ئەم نوسینەمان تایبەت کردووە بەوان کە ئازاربەخشترین جۆری تاقانەی ئەنفالن، چونکەلە تەمەنی منداڵیدا بون و پێویستیان بە بەخێوکردن و چاودێری بووە لە لایەن دایك و باوك و خێزانەکانیان، لەوساوە ئەم منداڵانە لەترس و دڵەڕاوکێیەکی هەمیشەییدا ژیاون، سەرەڕای نەبوونی شوێنێك بۆ ژیان، هەمیشەش ترسی دەسگیرکردنیان هەبووە لەلایەن پیاوانی رژێمی بەعسەوە، بۆیە تەنانەت ئەوکەسە دڵسۆزانەش کەتاقانەکانیان گرتۆتە خۆیان بەردەوام پاراستویانن لەچاوی خەڵك و بەتایبەتی پیاوانی رژێم، یان جێگۆرکێیان پێکردون، تا دوای راپەرینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان لە دژی سەدام و رژێمەکەی .

تاقانەی تریش هەن لە چوارچێوەی تاوانی ئەنفال، بەلآم ئەوانە خێزاندار بوون لە ژن و لە پیاو، یان پیاوەکە و منداڵەکان بێسەروشوێنکراون کراون،

ژنەکە بەتەنیا ماوەتەوە . بەلاّم ئەمەیان کەمترە چونکە زیاتر منداڵ لەگەڵ دایکیایە نەك باوك بۆیە زۆرینەی ئەم جۆرەتاقانانە باوکن، چونکە بەردەوام وابیرکراوەتەوە کە هێزە سەربازیەکان ژن و منداڵ دەسگیر ناکەن، بۆیە پیاوەکان خۆیان دەشاردەوە، بەلاّم پیاوانی سەدام دەستیان لە ژن و منداڵ و پیروپەککەوتەش نەپاراست تەنانەت ئەوانەی نەخۆشی دەرونیشیان هەبوو، لە تاوانی ئەنفالدا شوێنبزرکران، ئەم تاقانانە بەحوکمی ئەوەی تەمەنیان گەورە بووە لەو سەردەمەدا هەندێکان بە ئازاری چاوەروانی هاوسەر و منداڵەکانیان کۆچی دواییانکرد یانیش تاکوئێستا چاوەروانی خێزانەکانیانن یانیش جارێکی تر هاوسەرگیریان کردووەوخێزانیان دروستکردۆتەوە کە نموونەیان زۆرن وەکو (عاسی مستەفا و میدیر کۆپتەپەیی) کەخێزانیان دورستکردۆتەوە، بەلاّم کاك (مەحموود جەلەمۆردی) تاکو ئیستاش لە چاوەڕوانی هاوسەر و منداڵەکانی کات بەرێدەکات، چەندانی تر هاوشیوەیان هەن. بەگشتی تاقانەکانی ئەنفال پێویستە خزمەتی شایستە بکرێن بە هەموو جۆرەکانی تاقانەوە.

# تاقانەکانی ئەنفال وەك بەڵگەی زیندوو

ئەو بەڵگەنامانەی لەسەر تاوانی ئەنفال هەن زۆرن، وەکو نوسراوەکان لەدام ودەزگاکانی دەوڵەتی ئێراق هەرلەسەرۆکایەتی کۆمار و دام و دەزگا مەدەنی و حزبی و ئەمنی و سەربازی وهەواڵگریەکان سەبارەت بەجێبەجێکردنی تاوانی ئەنفال کە لەدادگای باڵای تاوانەکان پشتڕاستکرانەوە،جگە لە وێنەکانی ڤیدیۆیی و فۆتۆگراف وبیستراو و داننانی تاوانبارەکان بەتاوانی ئەنفال لەبەردەم دادگای باڵای تاوانەکان . ئێراق و گۆڕەبەکۆمەڵەکان و بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکان . ئێراق سەبارەت بەتاوانی ئەنفال و ئیدانەکردن و ناساندنی تاوانەکە بەتاوانی (جینۆساید) ی کوردو تاوانی (جەنگ) و تاوانی (دژەمرۆیی) ، تاقانەکانی ئەنفالیش لایەنێکی گرنگ و هەستیارن لەو بەڵگەنامانەکە دەکرێت بابەتیانە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، چونکە ئەم تاقانانە لەخێزانەکانیان بەتەنها ماون کە لەڕوی بونیان لە چوارچێوەی خێزانێك بە پێی بەڵگەنامەکان، وەك گریبەستی هاوسەرگیری باوك و دایکیان و ناسنامەی باری شارستانی (نفوس) کە دەیسەلمێنێ خانەوادەو باوك و دایك وخوشك وبرایان هەبووە و بەپێی وەفاتنامەکانیان کەبەڵگەیەکی یاسایی و فەرمیەلە پرۆسەی تاوانی ئەنفال بزرکراون، جگەلە گەواهیی خۆیان و کەس و کارو خەڵکی گوند و دەوروبەریان، لەهەمانکات تاقانەکان زۆربەیان لەسەروی تەمەنی ١٠ساڵیەوە بوون هەندێکیان وێنەی خێزانەکانیان تاکو ئیستا پاراستووە لەگەڵ پێناسەی باریشارستانی و رەگەزنامەی ئێراقی و بەڵگەکانی تر .

لایەنی دووەمی بەڵگەکان، دەتوانرێت وەکو شایەتحاڵێك گرنگی بە وتەکانیان بدرێت کە بریتیە لە سەرگوزشتەی تاوانی ئەنفال، لەناوچەکانیان

و چۆنیەتی دەستگیرکردنی خانەوادەو کەس و کارو دانیشتوانی گوندەکانیان و چۆنیەتی جیابوونەوەیان لە خێزانەکانیان و پەراگەندەبوونیان بەبێ لانەکە هەموو ئەم تاوانانەی سوپای ئێراقیان بە چاوی خۆیان بینیوە کە دواتر لە چــاوپێکەوتنەکانیان کەلــەتوێی ئــەم کتێبــە ئەنجامــدراوە زیــاتر پێــی ئاشــنادەبین،ئەگەر ســەرنجی تــاوانی جینۆســایدی جولەکــەکان بــدەین لــە چوارچێوەی (هۆلۆکۆست) ، لەهەموو ئەو سەنتەرو ناوەندانەی کە لە ولآتانی دونیــا دامــەزراون شــایەتحالەکان کەتاوانەکــەیان بەچــاوی خۆیــان بینیــوە یــادەوەری و ووتــەکانیان بــەردەوام لەسەرشاشــەی گــەورە گــەورە لێــدەدرێت و چەندبارە دەکرێتــەوەو وەرگێردراون بۆ سەر زمانــەکانی تر، دیارە ئەمــەش بۆ زینــدوڕاگرتنی ئــەو زوولمەیــە کــەلێیانکراوە، بۆ ئــەوەی پێناســەی مەزلومیــەتی خۆیان لە هەمووکاتێکدابکــەن و سەرنجی مرۆڤــەکان و دەسەلآتداریەتی ولآتــان بــۆلای خۆیــان کێــشبکەن، بۆیــە دەکرێــت بــە هەمانــشێوە دەســەلآتی کــوردی گرنگی بە تاقانەکانی ئەنفال بدات و دیکۆمینتیان بکات، هەرچــەندە بە توانــای هەندێ کەس لێرەو لــەوێ پچرپــچڕ کاریــان لەســەر کــراوە، بــەلآم ئەمــە تەواونیــە چــونکە ئەمــە کــاری حکومەتــەو دەبــێ لــە چوارچــێوەی دەزگایــەکی تایبــەت و بەپلان ئەم کارانە ئەنجامبدرێن و رێکبخرێن بۆئەوەی لــە فــەوتان ڕزگــار بکــرێن، تاقانــەکانی ئــەنفال پێویــستە لــە ناونــدە نێودەوڵەتیــەکان و کۆنفرانــسە نێودەوڵەتیــەکان بناســرێن، لــە چوارچــێوەی گێرانــەوەی بەســەرهاتەکانیان، بۆئەوەی سەرنجی خەڵکانی هەموو دونیا کێشبکەن، سەبارەت بە مەزلومیــەتی گــەلی کــوردو ئەوتاوانانــەی لــەدژی ئــەم خەڵکەمــەدەنی و بێبەرگریــەکراوە، لــە چوارچێوەی تاوانی ئەنفال لەسەر دەستی دەسەلآتی عەرەبی شۆڤێنی ئێراقی، کە دەکرێت لە ڕێی ئەم بەڵگەنامانەوە کوردپاڵپشتی گەورەی نێودەوڵەتی بە دەســت بــێنێ ودەوڵــەتی خــۆی دامــەزرێنێت و دواتــریش ئــەم پاڵپــشتیانە بــەردەوامبن بــۆ پاراســتنی دەوڵەتەکــەی لــە هــەموو ڕویەکــەوە، چــونکە

تایبەتمەندی دامەزراندی دەوڵەتی کوردی تاکە زامنە بۆ دووبارەنەبوونەوەی جینۆسایدی گەلی کورد،کەبەدرێژایی مێژوو ئەم تاوانانە لەدژی کورد دووبارەدەبێتەوە کە کۆتایی جار لەساڵی ٢٠١٤ لەدژی کوردانی ئێزیدی درێژەپێدرایەوە، لەکاتێکا دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی خواستی هەرتاکێکی کوردە، بەڵام دەوڵەتانی هەرێمی و عەرەبە شۆڤێنیەکان تاکوئیستا ئەم هەقە بەکورد ڕەوا نابینن وچاویان بەم کارە هەڵنایەت ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەرئەوەی دەوڵەتانی هەرێمی خواستی لەناوبردن و (جینۆساید) کردنی کوردیان هەرماوەو ناتوانن خۆیانی لێدەربازبکەن، چونکە ئەوان دەزانن گەلی کورد تاکە نەتەوەیە لەناوچەکە، هەولی بەدیموکراتیزەکردنی وڵاتەکەی دەدات، بەمەش پەردە لەسەر ڕووی دیکتاتۆریەتی ئەوان لادەدات.

خزمەتکردنی تاقانەکانی ئەنفال لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە ئەرکێکی ئەخلاقی و نەتەوەییە کە دەبێ گرنگی تەوایان پێبدرێت و مەدالیا و ناسنامەی تایبەتیان بۆ دروستبکرێت، بۆ ئەوەی لەدام و دەزگاکانی حکومەت وشوێنە فەرمی و نافەرمیەکان و لە ناو کۆمەلگادا دیاربن و بناسرێنەوەو رێزی تایبەتیان لێبگیرێت، ئەمەش باڵپشتێکی مەعنەویە کە لەڕووی دەرونیەوە کاریگەری زۆری دەبێت لەسەریان بۆ بەهێزکردنی کەسایەتیان و هەستکردنیان بەوەی سەرەڕای لەدەستدانی خێزان و کەس و کاریان، بەڵام هەستدەکەن کە حکومەت و هاونیشتمانیانیان پاڵپشت و پەنایانن و هەست بەبێکەسی نەکەن،چونکە ئەگەر بەسەرنجەوە گێڕانەوەی چیرۆکەکانیان بخوێنیتەوە بەتەواوی هەست بەلایەنە دەرونیەکانیان دەکەیت کەتاچەند کاریگەری بەسەریانەوە هەیە، تەنانەت ئەم لایەنە کاریگەری دروستکردوە لەسەر منداڵەکانیشیان.

# نموونەی چیرۆکی بەشێك لە تاقانەکانی ئەنفال

**ئەمەی خوارەوە چاوپێکەوتنی بەشیك لە تاقانەکانی ئەنفالە کە وەکونموونە هەڵمبژاردون، چیرۆکی هەریەکێ لەم تاقانانە گوزارشت لە بەسەرهاتی هەموویان دەکات.**

## کامەران فاتیح حەمید / تاقانەی ئەنفال:



**کامەران یەکێکە لە تاقانەکانی ئەنفال دانیشتووی گوندی (بەلەکەی گەورە) سەر بەناحیەی سەرقەڵا قەزای کفری، بەتەنها لەخیزانەکەی رزگاری بووە، کە ژمارەی ئەندامانی خیزانەکەی (٨) کەس بووە، پێکهاتبوون لە دایك و باوك و خوشك و برا، کامەران دوای ئەوەی لە خێزانەکەی دادەبڕێ وەکو منداڵێکی بێنەوا ڕووبەڕووی ژیانێکی قورس دەبێتەوە لێرەدا با لە زمانی خۆیەوە چۆنیەتی تاوانەکەو ژیانی ببیسین، لەناو گوندەکەی خۆیان لەبەیانیەکی بەهاردا، دەستمکرد بەپرسیارکردن هەتا ئەو شوێنەی لەخێزانەکەی دابڕ،ا هەموو ئەو دەشت و دۆڵ و شوێنانەمان بەسەرکردەوە کە خەڵکی ئەم گوندەو کامەران پێیا گوزەریان کردبوو تا دوا وێستگە،سەرئەنجام گەیشتمە ئەم چیرۆکە راستەقینەیەی کە کامەران لە زمانی خۆیەوە بۆی گێرامەوە.**

کامەران وتی : کاتی خۆی ئێمە لەم دێیە بووین، لە ناوچەی قەرەداغ و سەرکردایەتی شەر گەرمبوو لەم دەوروبەرەش جمووجۆڵی سوپای حکومەتی بەعس هەبوو، رۆژانە تۆپباران بوو، شوانی دەکوشت هەموو کەسێکی دەکوشت، بۆیە نەماندەتوانی لە ناودێکەی خۆمان درێژە بەژیانبدەین، لەخوارگوندەکە دۆڵێك هەبوو وەکو پەناگەیەك خەڵك خۆی لێ حەشاردابوو، هەرچەندە خۆمان شاردبووەوە بەڵام کۆپتەر بەسەرمانەوەبوو، رۆژانە خەڵکی دەکوشت، ژیاننەمابوو لەم سنورە، ئیتر شەوان خەڵك لەهەردەکەوە دەهاتەوە ناو گوندەکە پاروە نانێکی دروست دەکردو دەبوو پێش خۆرهەلأت بگەرێنەوە بۆ هەردەو دۆڵەکە، لە ١٩٨٨/٤/٨وە گوندەکەمان بەجێهێشت بە چۆڵی مایەوە، مەگەر خەڵك شەوان بۆ بردنی زەخیرە بهاتایەوە و دەگەراناوە بۆ دۆڵ و پەناگاکان،بەرۆژیش خەڵك لە کونە ئەشکەوت و حەشارگەکان دەمانەوە، مەگەرکە شەوداهات دەربچوونایەتەدەرەوە، مەرو ماڵاتیش بەرۆژ بەرەڵای ئەو هەرد و دەشتە دەکرا بەبێ خاوەن، کە شەو دادەهات دەچوون دەگەران بە شوێنیان ئەیانبینینەوە . هەموو پێداویستیەکانی ژیانمان دەبوو تەنها بەشەو دابین بکردایە وەکو ئاو و نان و پێداویستیەکانی تر، جگە لەگوندەکەی ئێمە گوندەکانی دەوروبەریشمان لەو هەردە گیرسابوونەوە، وەکو گوندەکانی (زینانەو دوراجی و ئۆمەربل و بەلەگەی خوارو و گۆبان عارەب وجوامێرئاغا) ، هەرکەسەو ئەگەر ئەشکەوتی دەست نەکەوتایە ئەوە شوێنێکی بۆخۆی چاککردبوو.چونکە ڤشارێکی زۆر لەسەرناوچەکە هەبوو ژیانی تیانەمابوو، ئەو خەڵکەی لەم هەردەیە کۆبووبوونەوە هەمووی خەڵکی مەدەنی و جوتیار و کاسب بوون. لەرۆژی ١٢/ ١٩٨٨/٤ (٥) فرۆکەی کۆپتەر هاتن هەموو هەردەکەیان بۆمبا بارانکرد، رانەمەرەکەی ئێمەی پێکا (٤٥) سەر مەر پێوەبوو، ناودۆڵەکەش پربوو لە ژن و منداڵ هەلیکۆپتەرەکەش کوێرانە بۆردومانی دەکرد جیاوازی لە نێوان منداڵ و گەورەو ژن و پیاو نەدەکرد زۆر بێرەحمانە مامەڵەی دەکرد. ئیتر بە تەوای ژیان نەما، هەموو ناوچەکە گیرابوو لە گوندەکان شەربوو، بەتایبەتی لە ئۆمەربل و زینانەو چەند شوینێکی تر، بۆیە

بەناچاری بە دۆڵەکەدا شۆڕبووینەوە بەرەو گوندی (قوری چای) بەرەو جادەی کفری سلێمان بەگ ژێر دەستی حکومەت، خەڵك هەبوو لەو هەردە شوورەی بۆ بەرخی کۆڕپە کردبوو لەتاو رزگارکردنی رۆحی خۆی بەرخەکانی بەوشێوەیە جێهێشت ئەو بەستزمانانە ئاوا بێخاوەن مانەوە. گەیشتینە دەربەندەکە من لەگەڵ براگەورەکەم ڕانە مەڕەکەمان پێبوو باوکم لەوێ هاتە لامان وتی:ڕەنگە یەك ببینینەوە ڕەنگە یەك نەبینینەوە، ناسنامەکەی خۆمی دامێ لەگەل (١٠) دیناری ئەوکات، (١٠) دینار و ناسنامەکەی براکەمیشی پێیدا بۆ ئەوەی چەند ڕۆژێ پێی بژین کە گیشتینە ناو (گوندی قوڕی چای) وەك ڕۆژی حەشر وابوو مەڕ و ماڵات و خەڵك تێکەڵ بەیەك بووبوون. کە گەیشتینە سەرجادەی کفری من منداڵبووم رامدەکرد بۆلای دایکم و براو خوشکەکانم دیسان رامدەکردەوە بۆلای ڕانە مەرەکە نەمدەزانی چیبکەم؟، تراکتۆرو عەرەبانەو زیلی سەربازی وەستابوون جاشەکان و سەربازەکان منداڵە بچوکەکانیان تورتێهەڵدەدا بۆناو بۆدیەکان . هەموو خەڵکەکەیان برد بەرەو (مرکزشباب دون) واتە ناوەندی لاوانی خورماتووی بەعس .ئیتر من رامکرد بۆلای براکەم لای ڕانە مەرەکە لەوێوە دابڕاین لە خیزانەکەمان،ئێمە (١٣) شوان بووین خەڵکی گوندەکەمان، هەرکەس ڕانە مەڕو ئاژەڵی خۆی پێبوو، بەڵام گەورەکان وتیان هەوڵبدەن بچنە ئەوبەری جادەکە چونکە ئەوبەر ماڵە عەرەبی لێبوو پێیان وابوو لەوێ وازمان لێدینن چونکە لای خۆمان قەدەغەکراوبوو، لای عەرەبەکان ئازادبوو، ووتیان ئەگەر ڕانەمەڕەکانیش لەوێ بن وادەزانن هی عەرەبەکانە، بەڵام ئۆتۆمبێلێکی سەربازی هات ئێمەی گرت، مام قادرێکمان لەگەڵبوو یادی بەخێر ئەنفالکرا، زمانی عەرەبی دەزانی بەڵام هەندی زمانی تەواو نەبوو کە قسەیکرد هەندێکیشیان لێیدا . ئیمەیان بەرەو کفری برد بۆ خورماتوو نە رۆیشتین، لەسەر جادەکە هەندێ خەڵکمان بینی دەست و چاویان بەسترابوو، هەندێ چەکیش لەبەردەمیان کۆکرابووەوە دیاربوو ئەوانە باوەڕیان بەو پروپاگەندانە کردبوو کە بەعسیەکان بلاویان کردبووە کە گوایە ئەوەی چەکی پێبێ پارچەیەك زەوی پێدەدەن، بۆیە چەکیان

پەیداکردبوو نەیاندەزانی ئەمە خراپە .منیش منداڵبووم دەچوومە نزیکیان و دەگەڕامەوە . ئیتر من لەگەڵ براکەم و مامم مەجید مامەوە، مامم پیاوێکی زۆر ئازاو رەشید بوو، ئەوەی ئیستا گوێی لەم قسەیەی من بێ شایەتیم بۆ دەدا کە پیاوێکی زۆر خانەدان بوو لەناوچەکە . ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی تەم و مژاوی بوو کەس ئاگای لەکەس نەبوو، باوەڕبکە ئەوەندە بێویژدان بوون بەرخ لەدایك دەبوو بە نوکەشەق فڕێیان دەدا کەندەکەوە، هەموو ڕانەکان بەسەرجادەکەدا دەرۆیشتن، سەربازەکانیش بە دەورمانەوە بوون بەچاوی خۆم بینیم بەرخێك لەدایکی بەربووەوە سەربازەکەبەشەق کوشتی، سەربازەکان هەموویان عەرەب بوون، لەگوندی قاهیرە تێپەر بووین بەرەو کفری چومەلای براکەم وتم: من ڕانەکەم . ووتی : برام بۆکوێ رادەکەی؟ وتم :کاکە تۆش ڕابکە چارەنوسمان دیارنیە، من هەرچەندە زۆر منداڵبووم بەلاَم تێگەیشتم خراپمان بەسەردێت بۆیە پێم ووت: مەڕەکان جێبێڵەو راکە خۆت دەربازبکە، باهەردووکمان ڕابکەین ووتم : من رانەکەم ئەگەربشکوژرێم, (١٠) دینارەکەی خۆشم دابەو .براکەم روتی من چەند ساڵە شەونخوونی دەکەم مەڕبەخێودەکەم جێی ناهێڵم بەڵکو گەیشتینە کفری دایانەوە پێمان . بەدەم ڕێوە هەربە براکەم دەوت باڕابکەین، تا گەیشتینە تەك گوندی کارێز خەڵك زۆر وەستابوون منیش دارەکەم فڕێداو چوومە ناو خەڵکەکەوە، پیاوێك دەستیگرتم وتی: بۆ کوێ دەڕۆی وتم : ماڵی خزمێکم لێرەیە، ماڵی مام برایم باوکی خەلیل کاریزێ، پیاوەکەش منی بردەماڵیان، خوشکێکی هەبوو خوا عەفووی بکات خزمەتێکی باشی کردم، هەموو خیزانەکە خەمیان دەخوارد ئەو شەوە لەوێ مامەوە، ئەوندە ترسابووم شەویش هەربەدەم خەوەوە رادەچەڵەکیم، خێزانی مام برایم زۆر حەنین بوو، هەر بەدیارمنەوە دەگریا، بۆیەیانی هەواڵیاندا بەماڵی خاڵم کورێکی خاڵم هاتەدوام بردمی بۆکفری، بەلاَم لێرە سەیتەرەیەك هەبوو بردمی لە پشت سەیتەرەکە سواری ئۆتۆمبێل بووین بەرەو کفری، بەلاَم کە گەیشتینە کفری بینیم لەناو سەربازگەکە براکەم و مامم و هاورێکانی چاویان بەسترابووەوە، ڕانەمەڕەکانیشیان لێیان ساندبوو،ئیتر جارێکیتر ئەوانم

نەبینیەوە، باپیرم رزگاری بووبوو واتە باوکی باوکم ئیتر لەگەڵ باپیرم مایندەوە هەر رۆژی دەچووینە ماڵەخزمێك، چونكە هەموو رۆژێ هەواڵ بلاو دەبووەوە کە ئەوەی لە ئەنفال رزگاری بووبێ دەیگرن بەو شێوەیە ماینەوە تا نەنکم لە گرتووخانەی نوگرەسەلمان گەرایەوە ئیتر لەگەڵ باپیر و نەنکم ماڵێکمان پێکەوە نا منیش کەمێك گەورەتر بووم بەلام پاش ماوەیەك باپیرم لە خەفەتا ئەمری خوایکرد، دواتر نەنکیشم ئەمری خوایکرد ئیتر ژیانم بە کولەمەرگی بەسەربرد بەتەنهایی و بێکەسی، تا راپەرینی ساڵی ١٩٩١ لەوساوە بووم بە پێشمەرگە مقەڕو کۆنە سەربازگەکان بووبوون بەماڵم بۆ هیچ کوێ ناڕۆیشتم هەرگیز مۆڵەتیشم وەرناگرت چونکە هیچ شوێنێکم نەبوو . دواتر لە ساڵی ١٩٩٨ هاسەرگیریم کرد ئیستا خاوەن (٤) منداڵم .

ئەمەی خوارەوەش ناوی قوربانیانی ئەندامانی خیزانی (کامەران فاتیح حەمید)ن کە لە تاوانی ئەنفال شوێنبزرکراون:

١- فاتیح حەمید ئەحمەد / باوکی
٢- حەربیە ئەمین سەمین / دایکی
٣- بەیان فاتیح حەمید / خوشکی
٤- تاریق فاتیح حەمید / برای
٥- جیهان فاتیح حەمید / خوشکی
٦- سوهام فاتیح حەمید / خوشکی
٧- گۆران فاتیح حەمید / برای
٨- شوان فاتیح حەمید / برای

## رۆستەم عەبدولکەریم عەلی / تاقانەی ئەنفال



لەشـەوێکی پـڕ لـەئارامی لـەماڵی کاکـە رۆسـتەم لـە قـەزای کفـری کـە (ئەیادکاکەیی) پارێزەریش هاوسەفەرم بـــوو، ڕووی ئووومـــی کامیرەکـــەم ئاراستەی کاکە رۆستەم کردو کەوتمە پرسیار و لیکۆڵنەوە لێی، لە چۆنیەتی پیـــادەکردنی تـــاوانی ئـــەنفال، لـــە ناوچـــەکەی ئـــەوان وبەتایبـــەتی لەگوندەکـەیان وئـەو ژیانـە ناخۆشـەی دوای دابرانـی لـە دایـك و بـاوك و بـراو خوشکەکانی بەسەری برد، هەرچەندە هەموو تاقانەکانی ئەنفال تەنها یەك تێرامان بەسە بۆ ئەوەی لە ئەهامەتیەکانی ژیانیان تێبگەی، لەوەلآمی پرسیارەکانمدا.

ڕۆستەم ووتی:

مـن نـاوم (رۆسـتەم عەبدولکـەریم) ە لـەدایکبووی سـاڵی ١٩٧٥ خـەڵکی گوندی (بابەکر) ناحیەی قادرکەرەم قەزای چەمچەماڵ.

سـەرەتای مـانگی ٤ بوو کـە ئەنفال دەسـتی پێکـرد لەناوچـەی ئیمـە، مـن تەمـەنم لـەنیوان ١١بـۆ١٢ سـاڵ دەبـوو، ئێمـە ئـەوکات نەمانـدەزانی بەوشـێوەیە ئەنفال بەسەرماندێت، بەشبەحاڵی خۆم هەستی ئەوەم نـەبوو کـە ئـەم حاڵەتە ئـەم کارەسـاتە بەسـەر میللەتەکامانـدێت . لەوکاتـە لـە دێیەکـەمان مـن لـە مـاڵی خۆمان دابرام لەگەڵ مامێکم بووم، هـەلآتین بـەرەو ناحیـەی قادرکـەرەم من هیچ

شـوینێکم نـەدەزانی، جگـە لـەنێوان ناحیەکـەو دێیەکـەی خۆمـان هیـچی تـر شـارەزانەبووم .دووسـێ ڕۆژ لەقادرکـەرەم مایـنـەوە هـیـچ سـۆراغێکی بـاوکم و ئەوان نەبوو هەرچەندە من بەلامـەوە شتێکی ئاسایی بوو خـەڵك پێمیان دەوت بۆ ناگەرێی بەدوای باوکت و ئـەوان؟ دواتـر وتیان لەملەسورە ئەنفالکراون.من هەروام دەزانی چەند ڕۆژێکەو دەگەڕێینـەوە بۆ دێکەی خۆمـان، نەمدەزانی کە ئەم هەمووگونـدەی کوردسـتان خاپورکراوەو ئەو هـەموو خەڵکە گیراوە، دواتـر چووین بەرەو کفری دوای (٦) مانگ ئینجا هەستمکرد کەس وکارەکەم لەتاوانی ئەنفال دەسگیرکراون و من بەتـەنها ماوم وەك تاقانـەی ئـەنفال .ئیتر من لەگـەڵ مامەکانم مامەوە، بەڵام زۆرجارئەچووم بۆبەغدا بە دوومـانگ ناهاتمـەوە چـونکە هەستم دەکرد کەسم نیە، نەك بڵێی نازیان پێنـەداوم هەستم دەکرد بۆشاییەك هەیە لەژیانم و وەك خەڵکی ئاسایی نیم، بۆخۆم لەبەغداو خواروی ئێراق بـووم، لـە چێشتخانەیەك کارمـدەکرد هەرلـەوێش نانمـدەخوارد و لـەویش دەخـەوتم، چـونکە هـیچ شـوێنێکم نـەبوو، دوای ئـەوە دەسـتم کـرد بـە مامەڵـەی کـڕین و فرۆشـتن و هـاوردن و بـردن بـە حـوکمی ئـەوەی زمـانی عـەرەبیم دەزانـی و شارەزاییم پەیدا کرد، دوای ڕاپەرینی بەهاری ١٩٩١ زیاتر پێش چاومان ڕونتر بوو، خـەڵك ئازاد بوو دەستمکردەوە بەکارکردن، بەڵام نـەبوونی کـەس و کـارم ئەوەندە ناخۆش بوو، تەنانەت لە جەژن و بۆنـەکان قـەت حـەزمنـەدەکرد بێمـەوە ناوچەکەی خۆمان، لـە سـەرەتای نەوەتـەکانیش مـن هـەر لەتەمـەنێکی هـەرزەیی بووم و پێویستم بە باوکم ودایکم هـەبوو، بەردەوام لە بۆنەو جەژنەکان حـەزم بەتـەنهایی دەکردو حـەزم دەکرد دوربم لەخـەڵك، لەوکاتانـە کە لەماڵی مامێکم یان پـورێکم یـان هـەرخزمێکی تـرم بوایـەم ئـەو بۆشـاییە هەرلـە گەڵم بـوو لـێم جیانـابووەوە، ئیـستاش کـە تەمـەنم بـەرەو (٤٠) سـاڵ دەڕوات ئـەم ئـازارە لـێم جیانابێتەوە، ئیستاش کە دەچم بۆ نەخۆشخانەیەك یان شوێنێك کەسم لەگـەڵ نیە هەست بە ئازارێکی زۆر دەکەم و تامردن لەبیری ناکەم، بەتایبەتی کاتێ کە دراوسێیەك یان کەسێك دەبینم دەڕوات بۆ شوینێك کۆمۆمەڵی کەس و کاری

بەدەوریەوەیە منیش هەربە تەنهام کەسم لەگەڵ نیە، برینەکەم دەکولێتەوە ئەوئازارە مەگەر هەرخوالەبیری ئێمەی تاقانەکانی بەرێتەوە، نەك من هەموو تاقانەکانی ئەنفال ئەو ئازارەیان هەیە.من هەندێ جار منداڵەکانم و هاوسەرەکەم دڵم دەدەنەوە، پێم دەڵێن تۆ تاقانەی ئێمە کەسی تۆین،زۆرجار منداڵەکانم پرسیاری ئەوەیان لێدەکردم ئێمە بۆچی مامما‌ن نیە پورمان نیە؟ پێیان ئەڵێم خوا ئیرادەی لەسەربوو ئەوتاوانەمان بەسەرهات کە باوك ودایك و براو خوشکم نەماون، شوکر بۆخوا هەندێ جار بەکورەکەم دەلێم لەجێی براکەم بە کچەکەم دەڵێم لە جێی خوشکەکەم، بەڵام نەمتوانیوە ناوی براو خوشکم لە منداڵەکانم بنێم چونکە رەنگە خۆشبێت کورێکت لەجێی برایەکت بێت، بەڵام زۆر جار بەوناوە بانگیان بکەی رەنگە زیاتر ئازارت بدات، چونکە ئێستاش یادگاریەکانی ئەوان لەگەڵم دەژین، یادگاریەکم هەیە لەگەڵ برا بچوکەکەم لە هەموو چاوپێکەوتنەکان باسی دەکەم برایەکم هەبوو قسەی نازانی دەیوت برسیمە پێمان دەوت برسی چیتە؟ دەیوت برسی (چای) مە ئەوەندە منداڵ بوو نەیدەزانی بڵێ برسیمە نان دەخۆم، ئیستا من هەرکاتێ (چای) دادەنرێت برینم دەکولێتەوە نەخاسمە ناوی مستەفا ی برام لە منداڵیکم بنێم، من لە خێزانەکەم شەش کەس لە تاوانی ئەنفال شوێنبزرکران خۆم بە تەنها مامەوە. ئەمەی خوارەوەش ناوی ئەندامانی خێزانەکەی (ڕۆستەم) ە کە لەتاوانی ئەنفال شوێنبزرکران:

١ – عەبدولکەریم عەلی ڕۆستەم / باوکم

٢ – گورجی محەمەد ڕۆستەم / باوەژنم

٣ – سەلیم عەبدولکەریم ڕۆستەم / برام

٤ – مستەفا عەبدولکەریم ڕۆستەم / برام

٥ – وەحدە عەبدولکەریم ڕۆستەم / خوشکم

٦ – زینەت عەبدولکەریم ڕۆستەم / خوشك

## ئاکۆ عەزەدین ئیسماعیل / تاقانەی ئەنفال



ئاکۆ لە پرۆسەی تاوانی ئەنفال زۆر منداڵ دەبێت بە جۆرێك هیچ شتێکی لەبیرنیە لە کۆی جیبەجیکردنی تاوانەکە، بەپێی گیرانەوەی کەس و کارەکەی تەمەنی هەر چوارپێنج سالێك بووە، گێرانەوەی چیرۆکی ژیانی ئاکۆ ئەوەندە جەرگبڕە مرۆڤ لە ئاستیدا هەست بە ئازارێکی دەرونی زۆر دەکات، لەگوندی (وارانی) ناوچەی داویە سەربە قەزای (خورماتوو) کە شوێنی لەدایکبوونی (ئاکۆ) یە و هەرلە وێش خۆی و خێزانەکەی بەر شالاوی ئەنفال کەوتوون هەرچەندە بنەماڵەی ئاکۆ لە بنەڕەتدا خەڵکی گوندی (گەرمك) ی هەمان ناوچەن، بەلأم باپیری ئاکۆ هەرلەکۆنەوە لەگوندی (وارانی) گیرساوەتەوەو ژیانی بەسەربردوە تا ڕۆژ ئەنفالکردنی بنەماڵەکەیان بەگشتی لە ئەنفالی سێ لە مانگی نیسانی ی ساڵی ۱۹۸۸، بەلأم خزمەکانی بنەماڵەی (ئاکۆ) هەموویان لە گوندی (گەرمك)ن هەرچەندە ئەوەی من بینیم خەڵکی وارانی خۆشەویستیەکی زۆریان هەیە بۆ ئاکۆ و بنەماڵەکەی (ئاکۆ)ش چونکە ئەم چاوپێکەوتنەم لەگوندی وارانی ئەنجامدا، بەهەمانشێوە بەشێکی تری چاوپێکەوتنەکەم لەماڵی (ئاکۆ) ئەنجامدا لەگەڵ خۆی و (مەجید کوردی) بەخێوکەری (ئاکۆ) و (پارێزەر سەید ئەحمەد) و (گەرمە ئیسماعیل) ناسراو بە ( فانۆس) کەدەکاتە پوری (ئاکۆ) لە قەزای خورماتوو، پرسیارەکانم ئاراستەکرد و گویم بۆ شلکرد، بەلأم

نایشارمەوە جاروباریش لە دڵەوە بۆی دەگریام، با لێرەدا جارێکی تر لەگەڵ ئێوەی خوێنەریشدا گوێی بۆبگرین وبائێوەش بزانن بەسەرهاتی ئەم منداڵە تاقانەیەی ئەنفال چیە؟ لەوەڵامی پرسیارەکاندا.

ئاکۆ وتی : من ئەوەی کە بۆمیان باسکردوە لە خێزانێك بووم لەدایك و باوك و چوار خوشك و برایەك، ماڵی مامێکم خۆی و هاوسەری ئەنفالکراوە منداڵی نەبوە مامێکی ترم خۆی و هاوسەر و پێنج یان شەش منداڵی ئەنفالکراون، ئەوکاتەی ئەنفال لەناوچەکەی ئێمە دەستی پێکردوە من تەمەنم نزیك چوارساڵ بوە، ئێمە ڕامانکردۆتە ئەم شاخ و هەردانەی پشتمانەوە، بەڵام سوپا هاتوەتە ئەویٚ هەموو خێزانەکانیان سواری هەلیکۆپتەرکردوە تەنها پیاوەکان ماونەتەوە، وەکو ئەوەی کە بۆمیانگێڕاوەتەوە پیاوەکان هاتۆتنەوە وتویانە منداڵ و ژنەکان هەلیکۆپتەر بردونی و براونەتە بارەگای ناوەندی لاوانی خورماتوو (مرکزشباب دوز) ، ئەمەی کەمن گیرامەوە تەنها لەزاری خزم و کەسوکارم بۆم گێڕدراوەتەوە دوای گەڕانەوەم بۆلایان، ئەوەی کە لەبیری منە لێرەوە بۆت باسی دەکەم من ئەوەی لەبیرم بێت و بزانم وهەستم بەبوونی خۆم کردبێت کاتێك چاوم کردەوە لە گرتووخانەی (ئەبووغرێب) بووم لەبەغدا تایبەت بوو بەمنداڵان،ئەوەم زۆر باش لەبیرە شێوەی ئەو ئۆتۆمبیلە قەفەسەی کەمنیان پێبرد دووپاسەوانی هەبوو کەلەکۆتایی دەرگاکە بەجیا شوێنی تایبەتیان بۆ دروستکرابوو دەرگای یەکەم دەچویتە ژورەوە جێی پاسەوانەکان بوو دەرگای دووەم دەچویتە ژورەوە جێی بەندیەکانبوو، ئۆتۆمبێلەکە زۆر گەورەنەبوو ناوەندبوو، نازانم شوێنەکە چۆنبوو بەڵام شێوازی گرتووخانەکەو ئەو دەرگایەی لێی چومە ژورەوە بۆ ناوگرتوخانەکە هەمووم لەبەرچاوە،ئێمە کە لەگوندی وارانی دەسگیرکراوین هیچیم لەبیرنیە بەمەزەندەی خۆم رەنگە ساڵێك دوای ئەنفالم لەبیر بێت، کاتیٚ کە ئێمەیان لە ئۆتۆمبێلە قەفەسەکە داگرد دوومنداڵی تریشم لەگەڵ بووکە کوردبوون بەخواناویانم لەبیر نەماوە ناوەکەیان ئاسۆ و شتێکی وابوو شێوازی قسەکردنیان وەك ناوچەی داویە

نــەبوو، شــێوازی قــسەکردنیان وەك ناوچــەی جافایــەتی و دەربەنــدیخان و ئەوناوەبوو، کەدامانیانگرد ناومـانی خوێنـدەوە و جلـو بـەرگیان لەبـەرمان دانا تەنها شۆرتەکەمان لەبەرما و هەندێ پشکنینی تەندورستیان بۆکردین، لەبەر نەخۆشـی ناومانیـان دیـسان خوێنـدەوە و وتـی ئاکۆعـەزەدین مـن وەڵامـم داوە ئیتر رەنگە پێشتر پرسیاریان لێم کردبێ منیش وتبێتم ناوم (ئاکۆ) یە ئەوەیان نـازانم چـۆنە؟، بـەڵام دواتـر زانـیم نـاوی سـیانیم لەسـەر فایلەکـەم نوسـرابوو لـەخوارەوەش نوسـرابوو منـداڵی ئەنفال. سـەید ئەحمـەدیش کـەخزمی نزیکـی منـە بەدواداچوونی کردبـوو بـەدوای منـدا ئـەویش فایلەکـەی مـنی بـینی بـوو، سـەید ئەحمـەد ئێستا هـەر پێیـی ئەڵێم بابە چونکە وەکوباوکێك هەڵسوکەوتم لەگـەڵ دەکـات و ژنـی بـۆم هێنـاوەو لـە تەنیـشت خـۆی خـانووی بـۆم کڕیـوەو چـاودێریم دەکـات. لـە گرتووخانەکـە ئـەوان بـەزمانی عـەرەبی قـسەیاندەکرد لەگەڵمان من هیچ تێناگەیشتم، تۆمەتێکیان دابوە پاڵم نەشمـدەزانی تاوانەکـەم چیە؟ماوەی ساڵێك زیاتر لەو گرتووخانەیە مامەوە سـەرەتا زۆر دەگریـام، بەڵام دواتر ڕاهاتم و هاوڕێم پەیداکرد و یاریم لەگەڵدەکردن، دایـك و بـاوك و ئەوانـەم لەبیر چووبوو، تـەنها خـەمی خـواردن و یـاریکردنم هەبوو،هـەر بـەهێماش قسەم لەگـەڵ پاسـەوانەکان دەکـرد دەسـتم بـۆ دەم و سـکم دەبـرد واتـە برسـیمە یـان تینومــە، دووهــاوڕێ کوردەکــەم دەیــانوت چــۆن داوای خــواردن بکــەین مــن پێمـدەوتن ئێـوە قسەمەکەن مـن بۆتـان داوادەکـەم کەبرسـیمان بوایـە بـەکوردی هـاوارم دەکـرد برسـیمە کـەدەهاتن بـە هێمـا تێیـانم دەگەیانـد دەسـتم بـۆ دەم و سکم دەبرد کەبرسیمانە هێمام بۆ پـەرداخ دەکـرد کەتینومانە،ئیتر خـەریك بـوو فێری ئەوە دەبووم داوای نان وئاو بکەم، ئێمە واتـە مـن و دوو کوڕەکوردەکە لـە ژوورێــك بــووین قەروێڵــەی دووقــات هــەبوو مــن لەســەرەوەبووم هاوڕێکــەم لەخوارەوە ئەویتریـشیان لەوبـەرەوە بوو،لەوماوەیـە بـرادەری عـەرەبم پەیـداکرد لەوانــەوە خــۆم فێــری زمــانی عــەرەبی دەکــرد دەســتم بــۆ دەمــم دەبــرد وەکــو هێمایەك بۆ خـواردن لێمدەپرسـین مانـای چیە ؟ دەیـانوت (اکل) واتـە خـواردن،

زۆرێك لەمنداڵەكان كەماوەی زیندانیان تەواو دەبوو كەس و كاریان دەهاتن دەیانبردنەوە،منیش نەدەمزانی كەی تەواو دەبم و كێ دێت وەرمدەگرێتەوە وتاوانەكەشم چییە دواتر زانیم من بە تۆمەتی دزی بەندكراوم تاكوئێستاش نازانم چیمكردوە؟ كاك (مەجید) ئەوپیاوەی منی گرتەخۆی ئەو وتی تۆ لەسەر دزی بەندكرابووی، دوای ئەوە منداڵێك تەمەنی چوارپێنج ساڵ بێت كوادەزانی دزی چییە؟ خۆئەگەر منداڵی ئاوابچوك ئەگەر شتێكیش بەرێ لێیدەبوورن، بەڵام ئەم عەرەبوو بەعسە ئەوەند زاڵم بوون حسابیان بۆ مرۆڤ ناكرد،هەندێجار پاسەوانەكان بە عەرەبی پرسیاریان لێدەكردم بەكوردی وەڵامم دەدایەوە ئەوانیش تێناگەیشتن دەستێكی بەرزدەكردەوەو دەرۆیشت،لە گرتووخانەكە زۆر ناخۆش بوو كە قوفڵەكەیان لە دەرگاكە دەدا ئیتر شەش حەوت كاتژمێر نایان كردەوە، لەگەڵ هەردوو هاورێكەم لەسەر قەرەوێڵەكان دادەنیشتین، زۆربەی ئەوانەی لەوێبوون ماوەی حوكمەكەیان تەواو بوو كەس و كاریان هاتن و هەركەس منداڵی خۆی بردەوە، رۆژێك بانگی من و دوو كورەكوردەكەیانكردو وتیان ئەفسەرەكە بانگتان ئەكات، كە چوین دیسانەوە روتمانیانكردەوە و پشكنینی تەندورستیان بۆمانكرد، لەوماوەیەی لەوێبووم كەسێكی باشی لێبوو لەوانەی لەسەر یەخەكەیان سێ ئەستێرەی هەبوو پێیان دەوت (مفەوەز) خۆشی دەویستم هەمووجار جلوبەرگی منداڵەكانی خۆی بۆ دێنام لەبەریدەكردم، سەرنجمدەدا زۆرگرنگی بەمن دەدا ئەوكاتەی كە چوینە لای ئەفسەرەكەش كەبەرێوەبەری ئەو شوێنە بوو لەگەڵمان هات لەپشتمانەوەبوو ئێستاش ناوی نازانم ئەوەندە دەزانم (مفەوەزێك) بوو خزمەتی دەكردم رەنگە ئیزنی لە بەرێوەبەری گرتووخانەكە وەرگرتبێ بۆ ئەوەی جلوبەرگی جوانم بۆبێنێ، گرتووخانەكە زۆر ناخۆش بوو، قژمانیان تەراش نەدەكرد رشك و سپێ لێمانی دابوو خۆمانیش نەدەشۆری منداڵبووین كەسیش نەبوو بمانشۆرێ خۆ بەرێوەبەرەكەش بە پاسەوانەكان نالێ برۆن بیانشۆرن، بەخوا جاریوا هەبوو بەمانگیش خۆمان ناشۆری، ئیتر لەوێ

جلوبەرگی تریان بۆمان هێنا لەچاو جلەکانی خۆمان جوانتر و پاکتر بوو ئێمە نەمانـدەزانی چـیمان لێدەکـەن وامانـدەزانی دەمانبـەن بـۆ شـوێنێکی تـر و بەندماندەکەن، لەو ماوەیەی لای بەرێوەبەرەکەبووین (مفەوەزەکە) هەرلەگەڵمان بوو دواتـر بەرێوەبەرەکـە وتـی بیانخەنـە نـاوئۆتۆمبێلی قەفەسـەکەوە، ئێمـەیان برد بـەرە و ئۆتۆمبێلەکـە (مفەوەزەکـە) لەگـەڵمان هـات پـێش ئـەوەی سـەرکەومە ناو ئۆتۆمبێلەکە لەپشتەوە باوەشی پێماکرد و سێجار سەریماچکردم و وتـی رەحمەتت لێبێ چەند منداڵێکی پاك و جوانی وەکو ئـەوەی منـداڵێکی هـەتیوم و دەستی بەسـەرمداهێناو خۆشەویستی خـۆی بـۆم دەردەبـڕی و دەگریـا ئـەو نەیـدەتوانی هیـچم بـۆ بکـات یـان بمباتـەماڵی خـۆی، چـونکە مـن منـداڵێکی بێکـەس بـووم، ئـیتر ئیمـەیان بـرد بـۆ شـوێنێکی تـر، بـەلأم کـە بردمانیـان بـۆ هاورێکانم دەگریام چونکە لێیان جیادەبوومەوە، سـەرەتا وامزانـی ئـەوێش هـەر گرتووخانەیـە فایلەکـەشمیان لەگەڵمـدا ناردبوو کـە لەسـەری نوسـرابوو منـداڵی ئەنفال، سەید ئەحمەدی خزمم وەکو وتم دیبووی، وتی بەچاوی خـۆم فایلەکـەم بـینی لێـی نوسـرابوو ئـەنفال، خۆشـی ڕەنگـە قسەت بۆبکـات، کـە چـوینە ئەوشـوێنە ئـەو بینایـە جیـاوازی هـەبوو لەگـەل گرتووخانەکـەی لێیبـووین، دیـواری حەوشـەکەی نـەرم بـوو خۆشـتر بـوو لـەویتر، کـە چـوینە ژوورەوە سـەیرمکرد منـداڵی لێیـە ئـافرەتی لێیـە لـەوێ ناومیـان نوسـی و بردمیـان بـۆ ژورەوە کە بینیم شوێنێکی تازەیە منداڵی تـری لێیـە هەستم بەغـەریبی دەکـرد چونکە بۆمن گۆڕانێك بوو و لـە هاورێکـانم دابڕابووم، بەلأم ئافرەتێکی لێبـوو کارمنـدبوو لـەوێ زۆر گرنگـی پێـدەدام خزمـەتی دەکـردم جلوبـەگی جـوانی لەبەردەکردم و کەرەستەی یاری منـدالأنی بۆدێنـام هەسـتمدەکرد کەسێك هەیـە گـرنگیم پێـدەدات، بۆیـە هەسـتم بەغـەریبی نـەدەکرد هـەر لای خۆشـیەوە دەیخەوانـدم کـچیش بـوو هێشتا شـوی نـەکردبوومالیان لـەپارێزگای (دیوانیـە) بـوو سـۆزی دایکایـەتی بەتـەواوی پێمـدابوو، دوو حەفتـە جارێك مۆڵـەتی بـوو دەچووەوە بـۆ ماڵـەوە لـە (دیوانیـە) ، مۆڵـەتی بـۆمنیش وەردەگـرد لەگـەڵ خـۆی

دەمیبردەوە بە شەمەنەفەر دەڕۆیشتین، وام لێهات لە (دیوانیە) بەرگەم نەدەگرد لەبەرئــــەوەی (مێـــشووله) یـــان زۆر گورەیـــە کـــە ئەیدابەیەکێکـــەوە قوڕەیدەکردبەسەریا ئاویشیان زۆر ناخۆش بوو سوێربوو ئاوی بەغدا زۆر خۆشتر بوو،بەهۆی پێوەدانی (مێشووله) وە کە دنیا زۆر گەرم بوو هەموو دەست و دەم و چاوم بووبوو بەبرین، بەڕێوەبەرەکە تەماشای کردم وتی ئەم منداڵە بۆ وایە؟ئەمە نەخۆشە ئەمە بەرپرسیاریە،بە ئافرەتەکەی وت تولێکی تەنکی پیابدە با (مێشووله) پێوەی نەدات، لەو شوینە زۆر حسابیان بۆ منـداڵی هـەتیوودەکرد هەرگـەیز لەمنداڵـەکانیان نادا،مـاوەی سـێ سـاڵ لەوێمامـەوە خواردنیـان لەسەرمێزەکان بۆمانـدادەنا زۆر جـار شـەرماندەکرد لەگەڵ یەك لەسەر خواردن، ڕۆژێکیان کوری بەڕێوەبەرەکە هاتەلامان ئەویش وەك ئێمە منداڵبوو جاروبار لەگەڵ باوکی دەهاتە ئەوێ، ئەو کەمێك لەمن گەورەتربوو پاڵێکی بەمنەوەنا لەسەرمێزەکە خستمیەخوارەوە منیش بەهێزی خۆم یەك مشتەم لێیداو رامکرد، ئەوەی لە کوری بەڕێوەبەربدات دەبێ چیلێبکەن؟ ئەمە بۆچوونی خۆم بوو هەرکوتەك و لێدانە، چونکە لە گرتووخانەکە زۆرجار شەرماندەکرد لێمانیان دەدا ئەگەر ناوبژیشت بکردایە، بۆیە رامکرد لەدەرگاکەوە، دەرگاکەکرابوەوە چونکە منداڵ لەوشوێنە ڕایناکرد لەبەرئـەوەی شـوێنێکی خـۆش بـوو، پاسـەوانێکیش لەبەردەرگاکـە هـەبوو بەڕێکـەوت ئەوکاتـە لـەوێ نـەبوو کەلـە دەرگاکـەش دەردەچـوی جادەیـەکی دووسایدبوو دەچوو بۆگەراج شیمال، ماوەیەك ڕۆیشتم باڵەخانەیەکی گەورەی لێبـوو پردێـك بەتەنیشتیا دەڕۆیشت ویستم لەپردەکە بپەڕمـەوە، دواتـر شـوێنێکی ڕاوەسـتانی پاسـەکان هـەبوو لـەوێ، هەرلـەوێ وەسـتام دەرگـای هەتیوخانەکەشم لێدیاربوو، نەشمدەزانی ئەم شوێنە کوێیە،پاسە دووقاتەکان دەهاتنە ئەوشوێنە، من هیچ پارەشم پێنیە بەجلوبەرگی هەتیووخانەوەشم وامدەزانی خەڵك هەمووی دەزانێ ئەم جلەی بەرم تایبەتە بە هەتیووخانە، ئەگەردەسـگیربکرێی دەتبەنـەوە ئەوێ،دووکـەس وەسـتابوون چـاوەڕێی

پاسبوون، پاسەکە هات ئەوان سەرکەوتنە ناوپاسەکە منیش لەگەڵ ئەوان سەرکەوتم، شۆفێرو ئەوەی پلیت دەبڕێ وایانزانی من لەگەڵ ئەودووکەسەم بۆیە داوای پارەیان لێنەکردم،خەڵك نایانزانی ئەوجلوبەرگەی لەبەرمە هی هەتیوخانەیە تەنها پۆلیس دەیزانی، لەناوپاسەکە چومە قاتی سەرەوە رێك بانسەری شۆفێرەکە، پاسەکە دەڕۆیشت و نەفەرسەردەکەوت و دادەبەزی، منیش نازانم بۆ کوێدەڕۆم یەك نەفەر لەسەرەوە مابوو دیاربوو کۆتایی هێڵەکەبووئەویش دابەزی، منیش بەدوای ئەودا دابەزیمە خوارەوە ئیتر ئەوپیاوە ڕۆیشت من تەنیامامەوە لەوناوە دەسوڕامەوە، ئەوەندە سوڕامەوە ماندوو بووم، دوکانێکی لەفە فرۆشم بینی خۆمێیاکرد زۆرم برسی بوو دوکانەکە لەفەی فەلافلی دەفرۆشت تومەز ئەو شوێنە گەڕەکی (سەورە) بوو کەرتی پێنج کەدوای ڕوخانی ڕژێمی سەدام ناوەکەیانگۆڕی بە (سەدر) ، من نەمدەزانی کوێیە ئەوپاسانەی دەهاتنە ئەوێ لێی نوسرابوو ژمارە (٨١) ، بەخاوەن دوکانەکەم وت لەفەیەکم بدەرێ برسیمە هیچ پارەشم پێنەبوو هەرنەشمدەزانی پارەش چیە؟ کابرای خاوەن دوکان هەرتەماشی دەکردم دیاربوو منداڵی ئەوگەڕەکە پیس و ملەوەس بوون منیش منداڵێکی پاك و جوان و سور و سپی بووم جیاوازیم هەبوو لەگەڵ منداڵەکانی ئەوگەرەکە، ئیتر لەفەکەی دایەدەستم ومنیش ڕۆیشتم کابرا بانگی کردم و وتی پارەی لەفەکەبدە، منیش وتم پارە...؟ پارەم پێنیە پارەی چی پارەچیە؟ کابرا وتی وەرە تۆکوڕی کێیی؟ وتم نازانم ترساشم بڵێم منداڵی هەتیوخانەم ، ئەترسام بمبەنەوە بۆ هەتیوخانەکە و بەڕێوەبەرەکە لێمبدات، چونکە من لەکوڕەکەیم دابوو هەرچەندە سەرەتا ئەولەمنیدا، بەلام باوەڕبەودەکات باوەڕبەمن ناکات،کابرای خاوەن دوکانەکە هەرچیەکی پرسی وتم نازانم ئیتر وتی باشە برۆ، لەوناوە دەسوڕامەوە ئەوەنەمزانی ئۆتۆمبێلی پۆلیس لەبەردەمم وەستا پۆلیسی فریاکەوتنی سەورەبوو تەماشایەکمیانکردو وتیان سەرکەوە نزیکەی کیلۆمەترێك ڕۆیشت گەیشتینە مەرکەزێکی پۆلیس، بردمیانە لای ئەفسەرێك

یـــەك ئەســـتێرە لەسەرشـــانی بوو،كـــات نزیـــك بـــانگی مەغریبـــە منـــیش زۆر مانـــدووبووم هـــیچ پرســـیاریان لێنـــەكردم زانیـــان منـــدالّی هەتیوخانـــەم قەرەوێڵەیـــەك لـــە ژووری ئەفـــسەرەكەبوو مـــنی لـــەوێ داناوپاڵكـــەوتم پارچەقوماشـــێكی ڕەنـــگ خاكیاندابەســـەرما خـــەوم لێكـــەوت لەبـــەر ئـــەوەی لەبەیانیەوە جگە لەو لەفەیە هیچی ترم نەخواردبوو ڕەنگە ئاوم خواردبێتەوەو ئاگـام لێنـەبووبێت، ئاگـام لـەخۆم نـەما دواتـر خەبـەرم بـووەوە بەتانیـەكی سەربازی بەسەرمەوەبوو، ئەم ئەفسەرەی كەمنیان بردەلای باوكی بەرێوەبەری یاریگـای نێودەوڵـەتی تـۆپیپێ بـوو لەبەغـدا ئەفـسەرەكە ئێـستاش مـاوە لەبەغـداماڵیان لەپـشت مەركەزەكـەوەبوو پیـاوێكی شـیعەبووپێیان دەوت ئەبوعەلی، دووساڵ لەمەوبەر چومە بەغدا سەرم لەماڵی مەجید كوردیدا ماڵی ئەفـسەرەكە هـەر لـەجێی خۆیـان مـابوو ماڵیـانم دەزانـی چـونكە جارێـك ئەفـسەرەكەمنی بردەمـاڵی خۆیان،ئەفـسەرەكە تەلـەفۆنی بـۆ (مەجیـدكوردی) كردبووكـە زۆر بـرادەری بـوو، ئـەم مەدجیـدە كـوردێكی فـەیلی بـوو دوكـانی سەرتاشینی هەبوو بەرامبەر مەركەزەكە، (مەجید) هات وتی وەلاَ ئەگەر مندالّی هەتیوخانەیە من برایەكم هەیە ماوەیەكە ژنی هێناوە بەلاَم مندالّی نابێت، ئەم كوڕە دەبـەم بۆمـاڵی خۆمـان، (مەجیـد) مـنی بـردەوە مـاڵی خۆیـان كەچـوینە ماڵەوە دایكی ژنێكی بەتەمەنبوو لەسەركورسیەك دانیشتبوو، مەجید كەقسەی دەكـرد بـەكوردی وەك خۆمـان نـەبوو جیـاوازی هـەبوو تێـی ناگەیـشتم وەكـو ناوچەی مەندەلی و خانەقین قسەی دەكرد، دواتر زانیم ئەمانـە كوردی فەیلین، بـەلاَم دایكـی مەجیـد تەقریبـەن وەكـو ناوچـەی خۆمـان (داویـە) قـسەی دەكـرد لەوباش تێدەگەیشتم بەكوردی و بەعەرەبی لێی تێدەگەیشتم،ئەم ماڵە كوردی فـەیلی بـوون خـەڵكی ناوچـەی منـدەلی و خانـەقین بـوون، بـەلاَم باپیریـان هەرلـەزووەوە هـاتبووە بەغدا، ئـیتر دیـاربوو لەوكاتانـەی كوردیـان دەردەكـرد و ناوچـەی كـوردی فـەیلییان بەعـەرەب دەكـرد، ئـەوانیش هـاتبوونە بەغـدا، ئەمـە ڕۆژێـك خـۆی بـۆی باسـكردم،كەمێك قسەیان لەگـەڵ كـردم، بەلاَم مـن زۆر خـەوم

دەهات هێشتا تێرخەونەبووبووم، بۆیە وتیان بابخەوێت خەوتم تا دوو ڕۆژ هەڵنەستام نەئاو ونەنان هیچم نەخوارد، ئەوان وایانزانی بوومن مردوم، دایکی مەجید تەلەفۆنی بۆ دوکانەکەی مەجید کردبوو، وتبووی ئەم منداڵە هەڵنەساوە لەخەو ئەترسم مردبێت، مەجیدیش هاتبوەماڵەوە، کاتی دەستی خستبوە سەردڵم لە شپرزەیی خۆی هەستی بەوەنەکردبوو کەمن دڵم لێدەدات، وتبووی قوربەسەرم ئەم منداڵەمردوە، خۆ دەسەلاتی بەعس گاڵتەنیە ئەی من چی وەلامی ئەبووعەلی بدەمەوە ئەو بڕوای بەمن هەبوو ئەم منداڵەی لەگەڵمنارد، مەجید بە بۆچوونی خۆی وتبووی ئەگەرمردبێ دەچم لەشوێنێ فڕەی دەدەم، بەلام دایکی دواتر هاتبوو دەستی لەشادەماری ملم دابوو بەمەجیدی وتبوو کوڕم ئەم منداڵە نەمردوە زۆر ماندوە و شوێنی ئاوانەرمی نەبینیوە، لەژیانیا لەشوێنی وانەرم نەخەوتوە بۆیە خەبەری نابێتەوە، ئەم منداڵە زۆر دەربەدەر بوە، کەس نەبوە سۆزی بداتێ، دوای ئەو دوو ڕۆژە مەجید و دایکی و براو براژنەکەی دەستی منیان گرت و بردمیان بۆ هەتیوخانەکە، وتم من مەبەنەوە بۆ هەتیوخانەکە لەکوڕی بەرێوەبەرەکەمداوە بەخوا لێمدەدەن هەمووم بۆ گێڕانەوە،مەجید دواتر بۆمی دەگێڕایەوە دەیوت ئەوەندە دەترسای کەتۆم بردەوە بۆ هەتیوخانەکە خەریك بوو لەترسامیزبکەیەتەخۆتا،

## مەجید عەلی حوسێن ناسراو بە ( مەجید کوردی ) / بەخێوکەری ( ئاکۆ )


ئاکۆ ، کاتی منداڵی لە باوەشی مەجید

مەجید دانیشتوی گەڕەکی (سەورە) یە لەشاری بەغدا کەدوای پرۆسەی ئازادی گەلانی ئێراق لەچنگی ڕژێمی بەعس شیعەکان ناویان گۆڕی بۆ (سەدر) ، مەجید ئەو مرۆڤە میهرەبانەی کە ئاکۆی تاقانەی ئەنفالی گرتە خۆی و بەخێویکرد و هەمیشەش بەدوای دۆزینەوەی کەسوکاری عەودالبوە و کۆڵی نەداوە تاکەسوکاری (ئاکۆ) ی دۆزیەوە، مەجید زۆر بەشانازیەوە باس لەکوردبوونی خۆی دەکات، وەکو کوردێکی شیعە، بەلام تاوانەکانی ڕژێمی بەعس لەچوارچێوەی تاوانی بەعەرەبکردنی ناوچەی کوردی فەیلی خێزانەکەی مەجیدی ئاراستەی شوێنێك کردوە کە کەس بەکوردی قسەنەکات واتەکوردی لێنیە بۆیە مەجید کەچاوی هەڵهێناوە ئاشنای زمانێك بوە کەزمانی دایکی ئەونەبوە .

من ئەم چاوپێکەوتنەم بەزمانی عەرەبی ئەنجامدا لەگەڵ (مەجید عەلی حوسێن فەیلی) ، دواتر وەرمگێڕا بۆ زمانی شیرینی کوردی،بالێرەوە گوێ لە (مەجید کوردی) بگرین کەچۆن (ئاکۆ) ی دۆزیوەتەوەو چۆن سۆراغی کەس و کارەکەی کردوەو چۆن ئەوانی دۆزیوەتەوە، قسەکانی کاك (مەجید) زۆر

کاریگەری هەبوو لەسەرم، چونکە لەگەڵ گێرانەوەی هەربابەتێك لەم چیرۆکە ڕاستەقینەیە خەرمانێك فرمێسکی هەڵدەرشت بەجۆرێك جاری واهەبوو قسەی بۆنەدەکراو منیش پرسیارەکانم ڕادەگرت و فرمیسك لەچاوم قەتیس دەما، بەلاّم بەحوکمی ئەوەی ئەوندە عەوداڵی ئەو وشانەبووم کە لەزاری (مەجید) ەوە دەردەچوو سەبارەت بەم چیرۆکە ئۆقرەم ناگرت و دیسانەوە پرسیارم لێی دەکردو دەمهاوردەوەگۆ، ئەم پیاوەمەزنە ئەوەندە بەسەلیقەوە قسەی دەکرد واتدەزانی چیرۆکەکە فلیمێکەو لەبەرچاوتا لەشاشەیەکەوە لێی دەڕوانی، بۆیە پێم وایە گێرانەوەی بەسەرهاتی دۆزینەوەی (ئاکۆ) لەلایەن (مەجید) ەوە تەواو ترە لەبەرئەوەی جیاوازیەك هەیە لەقسەکانی مەجید و ئاکۆ چونکە ئاکۆ دەڵێ لەمەرکەزەکەوە منی برد بۆماڵ مەجیدیش دەڵێ لە دوکانی لەفەفرۆشەکەبینیم بەحوکمی ئەوەی مەجید گەورەبوە و ئاکۆ منداڵبوە هەمووشتێکی وەك خۆی لەبیر نەبێ .بەلاّم بەڵنیاییەوە (مەجید) بە ئاگاداری ئەفسەری بنکەی پۆلیسەکە (ئاکۆ) ی هێناوەتەوە ماڵی خۆیان.

لەوەلاّمی ئەو پرسیارانەی ئاراستەی (مەجید کوردی) مدەکرد لەوەلاّمدا،

مەجید کوردی وتی : من ماڵم لە گەرەکی (سەدرە) لەبەغدا هەر لەمنداڵیەوە لەوێ گەورەبووم، دوکانی سەرتاشینم هەیە کەسێکی ناسراوم لە ناوچەکە، بەرامبەر دوکانەکەم خواردنگەیەك هەیە بەردەوام دەچمە ئەوێ نان دەخۆم، لە تەنیشت خواردنگەکەش بنکەی پۆلیسی (نەسر) هەیە ڕۆژێکیان چومە خوارنگەکە بەنیازی نانخواردن، کەسێك هەیە بەناوی (کازم) ئەویش لەوێبوو وتی مەجید ئەم منداڵە کوردەو بزربوە دیاربوو (کازم) گاڵتەی پێدەکرد (ئاکۆش) لەفەیەکی بەدەستەوە بوو زۆر تورە بوو لەفەکەی دابە زەویدا منیش سەرزەنشتی کازمم کردو پێم وت ئەومنداڵە گوناحە بۆ وایلێدەکەی؟ ئاکۆ جلەکانی زۆر پیس بوو لەبەر پیسی نەتدەزانی چ ڕەنگێکە، پێموت بابە تۆ زۆر پیسی بۆ نایەی پاکتبکەمەوە، بەلاّم ڕازی نەبوو لەگەڵم بێت، منیش وتم کەیفی خۆتە، کازم بە ئاکۆی وت بڕۆ لەگەڵ مەجید ئەوکوردە

بۆتـۆ باشـه کەچـی هەرنـەهات، دوای کاتـژمێرێك سـەیرمکرد ئـاکۆ لەبـەردەم دوکانەکـەم دەسوڕێتەوە هەرچۆنێك بیت ڕازیمکـرد بێتـەلام، من لـە دوکانەکـەم ئۆتـۆمبێلێکی یـاری منـدالأنم دانـابوو کـە منـداڵی بـچوك بهاتایـە بۆسەرتاشین و بگریایە بـەو ئۆتۆمبیلە ژێرمـدەکردەوە، وتم وەرە دەیـدەم بـەتۆ، بـەو ئۆتۆمبێلـە منداڵییـە سـەرنجیم ڕاکیـشاو هاتـە لام، وتم بۆخۆت،لـەناو دوکانەکـە دەسـشتۆر هەبوو ئاوەکەم بۆی کردەوەو دەستمکرد بەشۆردنی، کەچی وتـی لاچۆ سـەیرم مەکە منیش وتم بابە من ئەمـەوێت خـوا خێرم بۆبنوسێ کوڕەکەم سـەیرکردنی چی؟منیش وتم بەکـەیفی خـۆت،لێم پرسی لـەکوێ دەخـەویت؟ وتـی لـە بنکـەی پۆلیسەکە،وتم بۆ لـەوێ دەخـەوی؟ وتـی لەبـەر ئـەوەی ئەوشـەوەی منیان بردبـۆ ئەوێ و هیچ شوێنێکیشم نیە لێی بخـەوم، ویـستم بیبـەم بـۆ ماڵـەوە بەلأم ڕازی نـەبوو لەگـەڵم بێـت کەگەڕامـەوە ماڵـەوە بـاسمکرد وتم دایـە منـداڵێك هەیـە لەوجادانەدەگـەڕێت زۆر جوانـە هەرلـە (جـەلیل) ی بـرام دەچـێت، (جـەلیل) براگەورەمانـە چەندسـاڵێك بـوو هاوسـەرگیری کردبـوو منـداڵی نـەدەبوو دایـك و بـاوکم زۆر نازیانـدابوێ هـەمورمان خۆشماندەویـست،دایکم وتـی کـوڕم ئەگـەر منتخۆشدەوێت دەبێ ئەو کوڕەبێنیەوە بۆماڵـەوە،ڕۆژی دوایـی کـە گەڕامـەوە بـۆ دوکـان زۆر بـۆ (ئـاکۆ) گـەڕام لەهـەرچ کەسـێکم دەپرسـی (ئـاکۆ)ت نـەدیوە؟ دەیـانوت ئێـستا لێـرەوە تێپـەڕی،ئیتر لـەناکاوبینیم (ئـاکۆ) دەسـتی بەدەسـتی منداڵێکی ترەوەیە دیاربوو پێی وتبوو (مەجید) بۆتدەگەڕێ،ئیتر پێموت (ئاکۆ) بۆ نایـەیت بۆمـاڵی ئێمـە؟ ئێمـە منداڵماننیـە بۆ خـۆت خۆتبشۆ نانبخۆ بخەوە خزمەتتدەکـەین، ڕازیبووکەلەگـەڵم بێـت، پێمـوت خـەڵکی کوێی؟ وتـی عـەرەبی نـازانم ئەگـەر ئـەم پرسـیارەت لێـی بکردایـە ئـەیوت عـەرەبی نـازانم، منـیش وازم لەم پرسیارە هێنا بەلأم هەستمکرد شتێك هەیە،کەلـەدەگای حەوشـەمدا دایکم دەرگاکەی کردەوەو باوەشی بە ئاکۆیا کردو دەستی بـەگریانکردو وتـی دایکـت کـویربێ هـەردووکیان دەگریـان دیمـەنێکی زۆر حـەزین بـوو، منـداڵێك نـازانێ بەسـەرهاتی چـیە ئەسـڵ و فەسـڵی چـیە؟ بەڕاسـتی کارەسـات بوو،ئەوشـەوە

(ئـاکۆ) خـەوت ئەوەنـدە قـسەمان لەگـەڵی نـەکرد چـونکە مانـدوبوو ئەوەنـدە لەوجادانـە دەسـوڕابوەوە شـوێنی نـەبوو پـشویەکی لێبدات،بـەیانی هەسـتاین لەخەوخـەریکی نـاخواردنی بـەیانی بـووین یـەکێ لـە خوشـکەکانم لەوکاتـە لەخەوهەڵساو بەپڕتاو هاتەلای دایکم و وتـی دایە بەخوا ئـەم شـەو لەخـەوما دایکی (ئاکۆ) م بینی دەیوت ئێستا ئیسراحەتمکرد،ئاکۆ لەخەو هەڵنەستا مـن خـۆم ئامـادەکردو وەکـو ڕۆژانـی تـر چـووم بـۆ دوکان،درەنگانێـك ماڵــەوە پەیوەنـدیان پێمکـردو وتیـان (ئـاکۆ) هێـشتا لەخـەو هەڵنەسـتاوە منیش وتم باشـە باشـەو بێمـەوە کـە هاتمـەوە هـەر هەڵنەسـتابوو، زۆر ترسـام وتم ڕەنگـە مردبێت لەدڵی خۆمدا وتم ئەگەرمردبێت دەیبەم لەشوێنێك فڕەی دەدەم چونکە ئەمە بەرپرسیاریەتیە، هەندێ بانگمکرد جولایـەوە و خـۆی لێککێشایەوە وتم بابە هەڵسە تـۆ لـەدوێنێوە نوسـتوی، دایکم وتـی کـوڕم ئەمـە لەشـوێنی نـەرم نەخەوتوە خوادەزانێ لەکەیەوە لەسەر دۆشەك نەخەوتوە زۆر ماندوە، بۆ ڕۆژی دوایـی بـردم لەگـەڵ خـۆم کـردم بەشـاگردی خـۆم، لەگـەڵ خـۆم دەمهێنـاو دەمبردەوە بۆ ماڵ فێری ئەوەشمکرد کاتێ کەسێك دەهات سەری دەتاشی کە تـەواو دەبـوو پێـی بڵـێ پـیرۆزە بـۆ ئـەوەی بەخشیش وەربگرێـت، ئـیتر (ئـاکۆ) لەوماوەیە هەستی بەدڵنیاییکرد،کە ئاکۆشم هاوردە ماڵی خۆمان بە ئەفسەری بنکەی پۆلیسەکەم وت خۆمن کێشەم بۆ دروست نابێ سەبارەت بە بردنی ئەم منداڵە؟ئەفسەرەکە وتـی نـەخێر هیچ کێشەنیە چونکە مـن بەفـەرمی ڕادەسـتم نەکراوە خـەمت نـەبێ،ئیتر (ئـاکۆ) بووبـەکوڕی مـاڵ بـۆ هـەموو شـوێنیك لەگـەڵ خــۆم دەمـــبرد بەتایبـــەتی شـــایی و ئاهەنگەکان،تەنانـــەت کەســـوکار و خزمەکانیشمان خۆشیاندەویست زۆر جار دەیانبرد بۆ ماڵی خۆیان،بەلام مـن هەر لەهـەوڵی ئـەوەدابووم کەسوکاری بدۆزمـەوە برادەرێکی کوردم هـەبووناوی (قاسـم) بـوو لەسـەربازی بەیەکـەوە بووین،کەلەسـەربازی تـەواو بـووین ئـەو هاتووچۆی بەغدای دەکرد، هەر پەیوەندیمان مابوو کەدەهات بۆ بەغدا یـەکمان دەبینی، ئەمجارەیان کەهات بۆ بەغدا پێموت ناوی منـداڵێکت پێدەدەم بـەناوی

(ئاكۆ عەزدین ئیسماعیل) بەڵكو كەسوكاری بدۆزیـەوە، دوای سـێ ڕۆژ (قاسم) هاتەوە وتی ئەو بابەتە داخە، وتم بۆ؟ وتی وایانپێم وتوە،بەلأم من كۆڵم نەدا لـە بـەدوادا چـوون، كەسـێكی كـوردم دۆزیـەوە پێیانـدەوت (شـێخ) دوكـانێكی گەورەی هەبوو لە ناوچەی بابشێخ (باب الشیخ) نـاوی ئـاكۆم نوسیبوو لەسەر پارچـە كاغـەزێك خـستمە بـەردەمی و وتم شـێخ ئـەم كەسـە ناناسـی یـاخود پرسیارێكم بۆ بكەی؟ سەیرێكی كاغەزەكـەیكردو بەتوندی فڕەیداو وتـی كـێ تۆی ناردوە بۆلای من كێ بەتۆی وتوە كە من زانیاریم هەیە؟ پێموت وادیارە تۆ شێخی نەوەدەكانی، مەبەستم لەشێخی نەوەدەكان ئەوەبوو ئەوبەناو شێخانە هـیچ نـەبوون (سـەدام) كردبوونی بەشێخ، من پێموت خۆمن داوای هیچم لێت نـەكردوە یـان داوای نـانم لێـت نـەكردوە تـەنها پرسـیارێكم لێـت كـرد، ئـەوە پیاوێكی كوردبوو ئەوە هەڵوێستی بوو، ڕۆیشتم و بەجێم هێشت. دایكم پێـی خۆشـبوو (ئـاكۆ) بخوێنێـت، (ئـاكۆ) م بـرد بۆقوتابخانــە بـرادەرێكم لـەو قوتابخانەیە هـەبوو، بەلأم وتـی نـاتوانم بەفـەرمی وەریبگـرم تـەنهادەتوانم وەكو گوێگر وەریبگرم چونكە (ئاكۆ) هیچ بەڵگەنامەیـەكی فـەرمی نەبوو،هەرچەندە پیـشتر لەهەتیوخانەكـەش بەفـەرمی ئـاكۆم هـاوردبوو، بـەلأم ناچـاربووم لەبەر خوێندنەكـەی (ئـاكۆ) بەرمـەوە بـۆ هەتیوخانەكـەو ڕۆژانـی پـشوش بیهێنمـەوە مــاڵی خۆمــان چــونكە لــەوێ بەفــەرمی منداڵــە هــەتیوەكان دەیانخوێنــد و دەزگایـەكی حكومـەتبوو، (ئاكۆ) دوو ڕۆژ لـەوێبوو سـەیرمكرد هاتـەوە بۆ مـاڵ، وتم بۆ هاتیەوە ؟ وتـی ناخۆشـە لێمـدەدەن برسـیم دەبـێ، چەندجارێك (ئاكۆ) م بـردەوە هەردەهاتــەوە، سـەردانی بەرێوەبەرەكـەم كـرد وتم توخـوا ئاگاتـان لـە (ئاكۆ) بێـت وتـی باشـە كەچـی (ئاكۆ) لـەوێ گیرنـابوو و هەردەهاتـەوە، كۆتـایی جار چومە هەتیوخانەكە لە هاوڕێكانی ئاكۆم پرسی لێرە چۆنن بۆتـان ؟ وتیـان وەلاّ زۆر خــراپن لێمانــدەدەن ئەگــەر كاتــژمێر حــەوتی ئێــوارە نەخــەوین لێماندەدەن،باشە چ منـداڵێك هەیـە حـەوتی ئێـوارە بخـەوێت ؟كەزانیم زروفیـان بـەو شـێوەیەیە لـە هەتیوخانەكـە ئـیتر ئـاكۆم بـەیكجاری هێنـاوە لای خـۆم و

لەسەرتاشخانەکە دامنا ئەو پارانەی لەوێش بەدەستی دەهێنا لەگەڵ ئەو ڕۆژانەیەی کە خۆشم بۆیم دیاریکردبوو بۆم دەخستە داخیلەیەکەوە و بۆم هەڵدەگرد، کوڕێك هەبوو هاوڕێم بوو دوکانی هەبوو ناوی سیانی ئاکۆم بەویشدابوو بۆ هەواڵپرسینی کەسوکاری (ئاکۆ) ، ڕۆژێك تەلەفۆنی بۆکردم وتی ژن و پیاوێکی ناسیاوم بینیوە ناوەکەی ئاکۆم نیشانداون ژنەکە وتویەتی ئەم ناوە لام غەریب نیە، (موسەنا) هات بۆلام وتی منداڵەکە لەکوێیە وتم ئەوەتانێ وتی بەگوێرەی ناوەکەی مامی ئەم کوڕە برادەرمبوو، بەحوکمی ئەوەی (موسەنا) ماوەیەك راکردوی سەربازی بوە لە ناوچەی داویە، ئیتر دیاربوو ئەو برادەرانە بەدواداچونی تەواویان کردبوو  ئەو ڕۆیشت دوای حەفتەیەك سەیرمکرد دوو پیاوو ژنێك هاتن بۆ لام بۆ دوکانەکەم، لەوبەری جادەکەوە وەستابوون سەیارەکانیان ڕاگرتبووئەوەی لام سەیر بوو (ئاکۆ) یەکسەر ڕایکرد بۆ لایان لەگەڵ ژنەکە باوەشیان بەیەکدا کردوو هەردوکیان دەگریان، منیش پێشوازیم لێیانکردو هەندێ قسەمانکرد وتم بابڕۆین بۆ ماڵەوە، لەماڵەوە دانیشتین ئەوان وتیان ئێمە هاتوین وادەزانین ئەم کوڕە هی ئێمەیە، منیش وتم ئەوەی من بزانم ئەم کوڕە خەڵکی گوندی وارانیە ئایا گوندی وارانی هەیە؟ وتیان بەڵێ پارەیەکی زۆریشیان هێنابوو بۆمن، بەلاًم من قبوڵم نەکرد وەریبگرم،هەرچەندە ئەوکات گرانی بوو ئابڵوقەی ئابوری لەسەر ئێراق بوو خەڵك کەسانی خۆی فرەدەدا من بەچاوی خۆم جارێکیان ئۆتۆمبێلێکی سوپەرم بینی پیرێژنێکی فڕەداکەدایکیان بوو،بەلاًم من ئەم منداڵەم گرتەخۆم و نەمهێشت توشی هەڵەبێت و بەخێمکرد،دایکم پرسیاری لێکردن ئێوە کە دەڵێن ئەمە کوڕی ئێمەیە هیچ نیشانەیەکتان هەیە ئەو ژنەی کە لەگەڵیان بوو خوشکی باوکی ئاکۆبوو وتی  بەڵێ من نیشاندەزانم لەجەستەی ئاکۆ، لەگەڵ دایکم و (ئاکۆ) چونە ژوورێکەوە سەیریانکرد نیشانەکان وادەرچوو، دوای ئەوەی لەنیشانەکانی جەستەی (ئاکۆ) دلنیابوون ئێمە ڕازیبووین (ئاکۆ) بەرنەوە، دایکم بە سەید ئەحمەدی وت (ئاکۆ) بەرنەوە

بەلاّم هەركاتێك لێی بپرسین نابیّ بلّیّ حالّم باشنیە، (ئاكۆ) ئامادە نەبوو بڕوا لەگەلّیان بەلاّم ئێمە خۆمان ڕازیمانكرد بڕوا لەگەلّیان، پێموت بڕۆ لەگەلّیان بۆ ئەوەی ناسنامەی باریكەسیت (نفوس) بۆ دەربێنن و مافت زامن بكەیت،من زۆر بیرم لەم بابەتە دەكردەوە چونكە ئێمە كوردی فەیلین كێشەی ناسنامەو ڕەگەزنامەمان هەبوو دەردی زۆرمان خوارد بەدەست ڕژێمی بەعسەوە، بەلاّم لەسەر ئەوە ڕێككەوتین هەركاتێك (ئاكۆ) لای ئەوانی پێخۆش نەبێت بگەڕێتەوە مالّی خۆمان.

لێرەوە (مەجید كوردی) نەیتوانی بەردەوامبێت لە قسەكانی لەبەر گریان چونكە باسەكە هاتە سەر خۆئامەدەكردنی (ئاكۆ) بۆ ئەوەی مالّی (مەجید) جێبێلّیّ و لە گەلّ خزمەكانی بگەڕێتەوە بۆ (خورماتوو) تاوێكی باش مەجید گریا ئێمەش هەموو دلّمان پڕبوو لەگریان، دوای ماوەیەك (مەجید) چاوەكانی سڕیەوەو دەستی كردەوە بە قسەكان بەلاّم فرمێسك هەر بەسەر ڕوخساریا ڕێچكەی دەكردو وتی:

من سەربازیمكردوە وەكو ئەوە هاتە بەرچاوم كاتیّ سەربازێكی هاوڕێمان دەگوازرایەوە بۆ یەكەیەكی تری سەربازی پێخەف و كەل و پەلەكانی كۆدەكردەوەو دەرۆیشت و لە هاوڕێكانی جیادەبوەوە كە زۆرناخۆش بوو چونكە هاوڕێی سەربازی زۆر خۆشەویستەو وەك یەك خێزانت لێدێت لەگەلّ هاوڕێكانت،ناخۆشترینكات ئەوكاتەبوو (ئاكۆ) كەل و پەل و جل و بەرگ و تۆپ و یاریەكانی كۆكردەوەو كردیە گونیەیەكەوە لەگەلّ خزمانی ڕۆیشت بەلاّم هەر ئاوڕی دەدایەوە ئای چەند ناخۆش بوو، كە خواحافیزیمانكرد نیو كاتژمێر هەر (ئاكۆ) م لەباوەش گرتبوو،ئینجا ڕۆیشتن، دوای دوو مانگ دایكی ڕەحمەتیم وتی كوڕم دەبیّ بچی سەردانێكی (ئاكۆ) بكەیت نەوەك حالّی باش نەبێت، وتم باشە بڕیارمدا بڕۆم ڕۆژێك دواكەوتم دایكم وتی كوڕم بۆ نە ڕۆیشتی ؟ منیش وتم دایە (ئاكۆ) زۆر یاریزانی نێودەولّەتی (ڕۆبەرتۆ باجۆ) ی خۆشدەوێت لەبازار درێسێكی تایبەتیم بۆ بەكردنداوە بە ژمارە (١٠)

هێشتا دەرنەچوە بۆیە سەفەرەکەم دواخست، ڕۆژی دوایی درێسەکە تەواو بوو منیش ڕۆیشتم بۆ قەزای (خورماتوو) لەسەر ئەو ئەدرێسەی سەید ئەحمەد پێیدابووم، ماڵەکەم دۆزیەوە، پێش نیوەڕۆ بوو گەیشتمە ئەویٚ پیاوەکان لەماڵ نەبوون هەر ژنەکان لەماڵبوون، پرسیاری ئاکۆمکرد وتیان والەو گۆڕەپانە یاری تۆپێندەکات منیش چوم بۆ ئەویٚ (ئاکۆ) تۆپێنیدەکرد کاتێك منی بینی بەڕاکردن هات بۆلام، پێش هەمووشت لێمپرسی کەسوکارەکەت چۆنن بۆت؟ وتی زۆر باشن نانم دەدەنیٚ، وتم بابە نائنا مامەڵەیان چۆنە لەگەڵت؟ وتی زۆر باشە.

(مەجید کوردی) لەکۆتایی قسەکانی وتی: من کە ئەم کارەمکردوە چاوەڕوانی هیچ پاداشتێك نیم لەکەس بەلاٚم حەزمدەکرد سەرکردەکانی کورد بانگێشتمبکەن تەنها وێنەیەکیان لەگەڵ بگرم لە دوکانی سەرتاشخانەکەم هەڵیواسم و شانازیان پێوەبکەم و بلێم من کوردم و ئەمانەش سەرکردەکانی منن............؟

تێبینی : جێی داخە مەجید کوردی لەناوەڕاستی مانگی (٤)ی ٢٠١٦، لەکاتی بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبە ئەمری خوای کرد.

## پارێزەر سەید ئەحمەد گەرمکی / کەسی نزیکی (ئاکۆ)

گەرمکی پیاویکی زیرەك و شارەزا لەبواری یاسا و خاوەن پاشخانێکی رۆشنبیری و ئەزموونێکی باش لە ژیانی ڕابردویدا،ڕەنگدانەوە و کاریگەری تاوانی ئەنفال لە ژیانی سەید ئەحمەد بەتەواوی بەرجەستە بوە بەحوکمی ئەوەی پیاوێکی رۆشنبیرەو گوندەکەی و ناوچەکەشی کەوتۆتەبەر شالاٚوەکانی تاوانی ئەنفال،

بۆیە شارەزاییەکی تەواوی لە سەرتاوانەکە هەیە لەناوچەکەی خۆیان و هەمیشەش هەوڵیداوە بەدواداچوون لەسەر ئەو سەرەداوانەبکات کە

دەردەکەوتن لەسەر تاوانی ئەنفال، سەید ئەحمەد کۆمەڵێ زانیاری لەلایە لەسەر دۆزینەوەی (ئاکۆ) ی تاقانەو بەدواداچون و هێنانەوەی (ئاکۆ) دوای ئەوەی ئاکۆشیان دۆزیوەتەوەو هاوردویەتیەلای خۆی و هاوسەرگیریشی بۆی کردوەوئێستا لەتەنیشتی ماڵەکەی خۆی خانوویەکی بۆی کڕیوەو هەرلەوێ ژیان بەسەردەبات، ئەوەی منیش گوێبیستی بووم (ئاکۆ) هەربە باوکە بانگی سەید ئەحمەدی دەکرد. لێردا با گوێ لەسەید ئەحمەد بگرین بزانین چ زانیاریەکی هەیە لەسەر دۆزینەوەی (ئاکۆ) ، من دەستمکرد بە پرسیارکردن لە سەید ئەحمەد گەرمکی و لە وەڵامدا وتی:

لە ڕۆژانی سەختی پرۆسەی تاوانی ئەنفال و تاهاتنەوەی (ئاکۆ) ش من هەرلەم شارەبووم (خورماتوو) خەریکی کاری پارێزەری بووم هەندیجاریش کارەکانم دەکەوتنە بەغدا بەتایبەت لە دادگای سەربازی، هاتووچۆی دام و دەزگاکانی بەغدامدەکرد ناوبەناو لەم و ئەو دەمبیست کەمندالآنی ئەنفال لەزیندانەکانی ڕژێمی پێشوو هەن، خۆ کەسیش نەیدەویرا بەئاشکراباسی بکات و بەدواداچون لەسەر ئەودەنگۆیانە بکات، کە لەناوخەڵکدا دەبیسراو بگەیەت ڕاستیەکان، ڕۆژێکیان لەماڵ دانیشتبووم لێرە لە (خورماتوو) زاوایەکمان هەیە عەرەبە ماڵی لەبەغدایە کچی خزمێك هاوسەریە، تەلەفۆنی بۆکردم و وتی کارێکی زۆر پێویستم هەیە دەبیت بەیانی بێیتە لام بۆ بەغدا، ئەوکات مۆبایل نەبوو بە تەلەفۆنی نۆرماڵ قسەی لەگەڵکردم، بۆ بەیانی نەمتوانی بچم بەڵام ڕۆژی دواتر چووم بۆلای لە کۆمپانیای تەئمین وەتەنی لەبەغدا ئەوناوی (موسەنا) یە، موسەنا لە ساڵانی هەشتاوچوار و هەشتاوپێنج سەربازی هەڵاتوو بوو لەم ناوچانەی ئێمەبوو ناوچەی داودە سەربە قەزای (خورماتوو) کە دەسەڵاتی ڕژێمی بەسەرەوە نەبوو، لەبەر ئەوە خەڵکێکی زۆری ناوچەکەی ئەناسی بەحوکمی خزمایەتی ژناخوازی وەکو ئەوە وابوو کەیەکێك بێت لە خەڵکی ئەم شارەو ئەم ناوچەیە، ڕاستە ئەو کورد نەبوو زمانی ئێمە نەبوو بەڵام زۆر پەرۆشی خەڵکەکەبوو و زۆربەی تاوانەکانی ئەنفالی بەچاوی

خۆی بینی بوو بۆیە کاریگەری هەبوو لەسەری وەکو مرۆڤێك،کە چومەلای (موسەنا) وتی کەسێك لێرە لەگەڵمان فەرمانبەرە بەناوی (محەمەد مەشهەدانی) ماڵی خوشکێکی لەگەرەکی (سەورە) یە کە دەکاتە (سەدر) ی ئێستا، وتی ئەڵێ منداڵێك لەوگەرەکە هەیە خەڵکی گەرمکە ئەنفالکراوە ئەوماڵە بردۆتیانە لای خۆیان، منیش راستی سەرم سوڕنەما لەو قسەیە وتم بابەدوادا چوونی بۆبکەم، یەکەم جار چوین ئاکۆم لەدوورەوە بینی لەگەڵ ئەم کاك (مەجید) ە کە خۆی کوردێکی فەیلییە، (ئاکۆ) ش خۆی و دایك و باوك و باپیری و نەنکی و خوشك و براو دادە و مامەکانی بەمنداڵەوە هەمووی ئەنفالە، تەنها دوو خوشکی باوکی ماوە ئەویش لەبەر ئەوەی ئەوکات لەخوورماتوو بوون، وەلاّ یەکێکان دەسگیریش کرا بەلاّم دواتر لە لایەن خەڵکێکی جوامێرەوە رزگار کرا، هەندێ کەسی خەڵکی ئەم شارە رزگار کران ئەویش یەکێ لەوانە پوری (ئاکۆ) بوو، لەوێ پرسیارم کرد ئەم کورە ناوی چیە؟ وتیان ئەم کوڕە فایلێکی هەیە لە شوێنێك بەناوی (دار الدولة للصغار) واتە خانەی دەوڵەت بۆ منداڵان لەگەڕەکی وەزیریە، ئەم ماڵە گەیشتوونەتە ئەم فایلە کەلەسەری نوسراوە (من مفقودین عملیات الانفال في اطراف طوز) واتە بزربوەکانی شالاّوی ئەنفال لەدەوروبەری خورماتوو، ناوەکەش لەسەر فایلەکە نوسراوە (ئاکۆ نەسرەدین ئیسماعیل) ، منیش گەڕامەوە بۆ خورماتوو لای خزمان پرسیارمکرد لەسەر زانیاری سەبارەت بە (ئاکۆ) ، کچێکی ئامۆزام هەیە وتی ئاکۆ کوڕی (عەزەدین) ە بەلاّم لەبەر ئەوەی (نەسرەدین) ی مامی منداڵی نەبوو بەناوی (نەسرەدین) ەوە تۆمارکرابوو لای ئەوان بوو، ئەم ئاکۆیە ئاکۆی خۆمانە، ناردمان بە دوای هەردوو پووری وتمان ئێوە هیچ نیشانەیەك شتێ شك دەبەن بۆ ناسینەوەی (ئاکۆ) ؟ یەکیان وتی بەڵێ پێش تاوانی ئەنفال (ئاکۆ) زۆر لای من دەمایەوە دوو نیشانە (خاڵ) شکدەبەم لە جەستەی وتم چۆن؟ وتی یەکەم سەرلوتی کەلێکی تیایە دووەم خاڵێك بەجەستەوەی هەیە، لەسەر ئەم بنەمایە دیسان چوومەوە بەغدا ئەم کاك (مەجید) ە منی ناناسی

بێئـەوەی بزانێـت تەماشـای (ئـاكۆ) م كـرد ڕێـك وابـوو نیـشانەكەی سـەرلوتی، هاتمەوە جارێكی تر لەگەڵ سەید هاشم و سەید مستەفای ئامۆزام كە دواتـر بەر ڕەحمـەتی خواكـەوت پـوری (ئـاكۆ) شمـان بـرد لەگـەڵخۆمان چوینە بەغدا، یەكەمجار چووینە دوكانەكەی (مەجید) كە گەیشتینە ئەوێ پوری كەچاوی بە (ئاكۆ) كەوت باوەشیلێدا بە گریـان و باوكەڕۆ و عەشیرەت ڕۆ، ئیتر (مەجید) ئێمەی بردە ماڵی خۆیان، بەڵام (ئاكۆ) هـەموو شێوەو ئاكاری دەگەڕایـەوە سـەر باوك و مام و بنە ماڵەی خۆیان،ئەو ڕۆژەی ئاكۆمان هـاوردەوە ١٩٩٤/٤/٢٦ بـوو چـونكە ئـەو ڕۆژە هــەموو پاسـەكان (حجـز) كرابـوو بـۆ بـیرەوەری یـادی لەدایكبوونی سەدامی گۆڕبەگۆڕ،هیچ ئۆتۆمبێلێك لەگەراج نـەبوو، مـن وتم ئـاكۆ لەگەڵ خۆم دەبەمـەوە هەرچۆنێك بێت ئەوكات مـن ئەفسەربووم پلـەم مولازمی حقـوقی بـوو ناسـنامەكەم بـە ئینزباتـەكان نیـشاندا ئۆتۆمبێلیـان بۆمـان ڕاگـرد ڕیمیكـی گـەورەكان بـوو پێـی هاتینـەوە بـەڵام دوانەكـەی تـر لـەوێ مانـەوە، گەیـشتینەوە مـاڵ، خـەڵكی كـەمم لـەم مەسـەلەیە ئاگـادار كردبـوەوە بـەڵام هەركەسـێ ئـەهات ئـەگریان و یادەوەریـەكانیان بەبیردەهاتـەوە و چـاوی بـە ئاكۆدەكـەوت دەبـوە شـایەتحالێك كـە ئـەم كـوڕە پارچـەیەكە لـە بـاوك و مـام و باپیری وكەسوكاری كە هیچ گومـانی تیانیـە، دوای ئـەوە جارێكی تر گەڕامەوە بـۆ ئـەو هەتیوخانەیـەی كـە (ئـاكۆ) ی لێبـوو چـومە سـەر فایلەكـەی كـە بـەو شـیوەیەی باسـیانكرد وابـوو، بـەڵام كێـشەكەم ئـەوە بـوو نـە دەمـوێرا بڵـێم كەسـوكاری منـە نـە هـیچ ئامێرێكی كۆپیـشی لێبـوو فایلەكـەی كۆپی بكـەم نـە دەشمتوانی فایلەكەبێنم، دوای نـەمانی ڕژێمـی بەعسیش دیـسان چومەوە ئـەو هەتیوخانەیە نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێك چونكە فایلەكـەیان پێنـەدام، بەڵام لـە هەوڵەكانی خۆم نەوەسـتاوم تـاكو ئێـستاش لەداهاتوشـدا هەربەردەوامـدەبم،من بەردەوام پارێزگـاریم لـە (ئـاكۆ) دەكـرد لەبـەر ئـەوەی دەترسـام ڕژێـم دەسـگیری بكـات چـونكە ئێمـە لـە (خورمـاتوو) لـەژێر دەسـتی حكومـەتی بـەعس بووین،لـە سـاڵی ١٩٩٤ وە مـن نەمدەهێـشت (ئـاكۆ) بـۆ هـیچ شـوێن بـڕوات بەتایبـەت بـۆ

ئەودیوو واتەسنوری دەسەلآتی هەرێم چونکە ئاشکرادەبوو و خەتەر بوو لەسەر ئێمە،سالی ٢٠٠٠ (ئاكۆ) چووبوو بۆ سنوری گەرمیان سلێمانی بێناگاداری من ئیتر نازانم کێ لەپشت ئەمبردنەوە بوو، خزمانی من ساداتی گەرمك لە خورماتوو و لە کفری و کەلار هەن سەید (عدنان) ی ئامۆزام ئەوکات بەرپرسی دەزگای شەهیدان و ئەنفالی (کەلار) بوو تەلەفۆنیان بۆمکرد وتیان (ئاكۆ) لە یەکێ لە کەنالەکان دەرکەوتوە و باسی ئەنفالی کردوە ئێمە زۆر ترساین دواتر باش بوو هیچ نەبوو (ئاكۆ) نەهاتەوە تا دوای ئازادی ئێراق لە سالی ٢٠٠٣، بەلآم حکومەتی هەرێم شتی باشیان بۆیکرد خانوویان داپێیی پارەیانداپێیی لە دوای پرۆسەی ئازادی ئێراق خانوەکەی کەلارم بۆی فرۆشت و ئەم خانوەی کە تێدا دانیشتووین خاوەنەکەی وتی دەیفرۆشم ئەگەر پێویستە دەیدەم بەتۆ منیش وتم وەلآ ئەوەندە پێویستمە هەتا خوادەلێت بەس، ئیتر ئەم خانوەمان بۆی کری دوای ئەوە ژنیشمان بۆی هێنا ئێستا دوو کوری هەیە بەناوی (محەمەد و ئەیوب) .

## گەرمە ئیسماعیل جەلال ناسراوە بە (فانۆس) / پوری (ئاكۆ)

لە بنەمالەکەی (ئاكۆ) تەنها دوو پوری ماوە کە خوشکی باوکین، ئەوانیتر هەموویان لە پرۆسەی تاوانی ئەنفال بزرکراون، فانۆس شارەزای نیشانەکانی جەستەی (ئاكۆ) بوە بەحوکمی ئەوەی دایکی (ئاكۆ) ئەوکاتانەی کە هاتوە بۆ شار بۆ کرینی کەل و پەل و پێداویستی هەمووجار ماوەی شەو و رۆژێك دەمایەوە لە خورماتوو لەمالی (فانۆس) ی پوری (ئاكۆ) لەهەمانکات مالی باوکی دایکی ئاكۆشبوو چونکە پوری و دایکی ژن بەژنیان پێکراوە، لەم کاتانەشدا (ئاكۆ) لای پوری (فانۆس) دەمایەوە و هەموو جار پوری (ئاكۆ) ی شۆردوە بۆیە شارەزای نیشانەکانی جەستەی ئاكۆ بوە. با هەموو ئەم قسانە لەزاری فانۆس خان ببیسین، هەر لەمالی (ئاكۆ) لە خورماتوو پرسیارەکانم ئاراستەی (فانۆس) خان کردوو بەمشێوەیە وەلآمی دامەوە و وتی:

لەبنەماڵەی ئێمە (سێ برام بەژن و ماڵەوە ئەنفالە دایکم و باوکم) یش تەنها من و خۆشکێکم ماوین لەگەڵ ئەم کوڕەی هێناومانەتەوە،ئاکۆ دایك و باوك برایەك و چوار خوشکی ئەنفالە، باوکی ئاکۆ برامە و من ژنم بۆی کردوە، یاخوا کاك (مەجید) خوا بۆمانی بهێڵێت کەرەمی خواو ئەو بوو (ئاکۆ) مان دۆزیەوە،ماڵ کاك (مەجید) لەگەرەکی (سەورە) بوو چووین بۆ ماڵیان بە ترس و لەرزێ ئەچووین بۆماڵیان لەترسی حکومەتی بەعس،خزمێکمان هەیە لە بەغدا ناوی (موسەنا) یە زاوامانە وتی کورێك هەیە لەماڵێك ناوی (ئاکۆ) یە، پێشتریش کە دوای شەش مانگ هەندێ خەڵکی ئەختیار لە نوگرە سەلمان گەڕانەوە وتیان لە تکرێت یەکێ لە برازاکانت بزربوو بوو براژنەکانت هەر بۆی دەگەڕان، ئیمە لەگەڵ کاك (سەید ئەحمە) و ئەوان چوین بۆ بەغدا لەوێ چوینە دوکانەکەی کاك (مەجید) بینیمان ئاکۆ لەوێیە کاتێ ئاکۆ چاوی بەمن کەوت خێرا ڕایکرد بۆم منیش چووم بۆی باوەشمان بەیەکداکرد ئەو بگریە من بگریە یەکسەر دڵمان بۆیەك چوو (ئاکۆ) دەستی گرتم و وتی جێم نەهێڵی ئەو بەعەرەبی و من بەکوردی (ئاکۆ) کوردی لەبیر چووبوەوە یەك وشەی نازانی،ئیتر چوینە ماڵی کاك (مەجید) ماوەیەك دانیشتین چایمانخواردەوە و نیشانەکانم پێیان وت ڕاستدەرچوو، چونکە من کاتی خۆی دایکی ئاکۆ دەهات بۆ ماڵمان جگە لەوەی من پوری (ئاکۆ) بووم ماڵی ئێمە ماڵی باوکی دایکی (ئاکۆ) ش بوو چونکە من ژن بە ژنم پێکرابوو بۆ باوکی (ئاکۆ) ، ئەوسا کە لەگەڵ دایکی لەدەشتەوە دەهاتن بۆ شت کڕین دایکی دەچوو شت بکرێت (ئاکۆ) لای من دەمایەوە دەمخافلاند و دەمشۆری بۆیە شارەزایی تەواوم هەبوو لەسەر جەستەی ئاکۆ، ئیتر ئاکۆمان هاوردەوە بۆ (خورماتوو) .

## ئەدیبە کاکەرەش سابیر/ تاقانەی ئەنفال



ئەدیبــە خــان خــەڵکی گونــدی (جەلــــــەمۆرد) ە ســــــەربەناحیەی (ئاغجەلەر) قەزای چەمچەماڵ لەساڵی ١٩٨٨ لەسـەردەمی ئـەنفال تەمـەنی تەنها (٨) ساڵ بووە، هۆکاری دابرانی لەدایك وباوکی و رزگاربوونی لەتاوانی ئەنفال ئەوەبووە کەبرازایەکی نەخۆش بــووە، ئەدیبــەش لەگــەڵ بــاوك و براژنێکی دەیبەنە ناحیەی تەقتەق بۆ چارەســەرکردن، بــاڵێرەدا گــوێ لــە ئەدیبەخان بگرین لە زمانی خۆیەوە، لەوەڵامی پرسیارەکانمدا

ئەدیبە خان وتی :من ئەوکاتەی ئەنفال دەستی پێکردمنداڵبووم پێش ئەوەی پیاوەکانی سەدام پەلاماری گوندەکەمان بدەن بەچەند رۆژێك، برازایەکم نەخۆش بوو لەگەڵ باوکم و براژنەکەم بردمان بۆ تەقتەق، بەهۆی ئەوەی لەوێ چارەسەری تەواوی بۆ نەکرا، باوکم برازاکەمی برد بۆ هەولێر، دواتر باوکم هاتەوە تەقتەق و هەندێ شتڵی کڕی بۆ زەرعات و گەرایەوە بۆ گوندەکەمان (جەلەمۆر) ، بەڵام من هەرلە تەقتەق مامەوە، من هەرچاوەروانی باوکم بووم بگەرێتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵی بڕۆمەوە بۆ ماڵی خۆمان لە گوندەکەی خۆمان و ناو خێزانەکەم، بەڵام هەر ئەو رۆیشتنەی باوکم کۆتایی بەدیداری من هێنا لەگــەڵ ئــازیزانم تــاکو ئیــستاش هەرنەگەرایــەوە، دواتــر وتیــان هــەموویان دەسگیرکراون و شوێنبزرکراون، واتە ئەنفالکراون ئیتر لەوڕۆژەوە کەمن لە

تەمـەنێکی منداڵیـدابووم کەتـەنها تەمـەنم (٨) سـاڵبوو، بەچـاوەڕوانی و چـاوبە فرمێسك مامـەوە، بۆ خۆحەشاردانیش لە چنگی پیاوانی بەعس، هـەر ڕۆژەی لـەماڵی خزمێـك خاڵێـك پورزایـەك، لەگـەڵ براژنەکـەم دەماینـەوە، سـەرە ڕای ئـەوەی کـەس و کارەکـەمان دەسـتگیر کرابـوو، ترسـی ئـەوەشمان هـەبوو خۆمـانیش دەسـگیربکەن، بەتایبـەتی مـن منـداڵبووم زۆر دەترسـام لـە سەربازەکان و جاشەکان، ئەگەر لە هەرشوێنێك ئەوجاش وسەرباز و پیاوانی ڕژێمـم ببینیایـە یەکـسەر ڕامـدەکرد، هـەتا سـاڵی ١٩٩٢ لەگـەڵ براژنەکـەم بەیەکەوە ماینەوە دواتر خاڵم منی بردەلای خۆی، هەتا ساڵی ٢٠٠٣ لای خاڵم مامـەوە ئیترگـەورە بـووم و هاوسـەرگیریمکرد، بـەلام هـەتاکو ئیـستاش هـەر چـاوەڕوانی کـەس و کارەکـەمم بێنـەوە . ئەدیبـە جگـە لـە خێزانەکـەی خـۆی چەندین خزمی تری لە و گونـدە ئەنفالکراون وەکو خۆی دەڵـێ لـە ژمارەنایـەن، ئەمـەی خـوارەوەش نـاوی خانەوادەکـەی ئەدیبەخانـە کـە لـە پرۆسـەی تـاوانی ئەنفال بێسەرو شوێنکران:

١- کاکەرەش سابیر نادر لەدایکبووی ساڵی ١٩١٠ باوکی
٢- بەفراوە محەمەد فەقێ لەدایکبووی ساڵی ١٩٢٥ دایکی
٣- نادر کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٢ برای
٤- سەفەر کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٦٨ برای
٥- جومعە کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٢ برای
٦- سابیر کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٧١ برای
٧- شوکر کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٥ برای
٨- ئومێد کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٧ برای
٩- نەجیبە کاکەرەش سابیر لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٥ خوشکی

## فەرهاد رەشید ئەمین /تاقانەی ئەنفال



فەرهاد لەدایكبووی ساڵی ١٩٧٧ خـەڵكی گونـدی (زینانــە) ی ثوورو سـەربە ناحیـەی (نـەوجول) قـەزای خورماتوو، چیرۆكی دابرانی فەرهاد لە خێزانەكـەی زۆر جیاوازەلـەوانی تـر، چـونكە فـەرهاد لــە پەنجــەرەی ئەوپاسەوە خۆی فڕێدەداتە خوارەوەو رایكــردوە و خــۆی دەربــاز كــردوە، چــیرۆكی دەربــازبوونی فــەرهاد زۆر كاریگـەری هـەبوو لەسەرم. ئـەورۆژەی ئـەم چـاوپێكەوتنەم لەگـەڵ فـەرهاد ئەنجامـدا لەناوگوندەكـەی خۆیانـەوە تـاكو گەیـشتینە (مركزشـباب) ەكـەی ناوشارۆچكەی خورمـاتوو كـە شـوێنی كۆكردنـەوەی هاونیـشتمانیانی كـورد بوو، زۆربەی رێگاكە بە پێ بڕیمان لەرۆژێكی هاوینی زۆر گەرم تاقەت پڕوكێن كـە قوربانیـەكانی ئـەنفالیش هـەر لـەو ریگایـەوە هـاتبوون، هـەموو ئـەو شوینانەمان بەسەركردەوە كە پێیاتێپەڕبووبوون، تا ئەوشوێنەی كە فەرهاد خۆی دەربازدەكـات كـە (مركزشـباب) ی خورمـاتوو بووناوەنـدی كۆكردنـەوەی قوربانیـەكان، خوێنـەری بـەرێز فەرموو با لـە زمـانی فەرهاد خۆیـەوە چیرۆكی دابـڕان و رزگـاربوونی ببیـسین كـە لـەماوەی رۆژێكـی تـەواو لەگـەڵ فـەرهات پرسیارەكانم ئاراستە دەكردو ئەویش وەڵامی دەدامەوە،

فەرهاد وتی: گوندەكەی ئێمە لە مـانگی١٩٨٨/٤ هێزەكانی سوپای ئێـراق گەمارۆیدا، من ئەوكات تەمەنم ١٠بۆ١١ساڵ بوو، نـەك هەردێكـەی ئیمـە خـەڵكی ناوچـەكە هـەمووی شـەڵەژابوو، وتیـان سـەركردایەتی گیراوەوحكومـەتی ئێـراق

هێزێکی زەبەلاحی لە سنورەکان کۆکردۆتەوە، ئیتر ناوچەی قەرەداغ گیرابوو، کەپەلامارەکان لەوناوچانەوە دەستی پێکردبوو،خەڵکەکە ورەی دابەزیبوو چۆکی شکابوو،بەتایبەتی کەناوچەی قەرەداغ گیرا. ئیترقسەیەکی کوردی هەیە دەڵێ: (سەردەرکەو ماڵ پرسیاری نیە) ،خەڵکەکە سەری لێشێوابوو هەندێك دەیانوت دەڕۆین بۆ ئێران هەریەکەو قسەیەکی دەکرد، هیچ کەس پێشبینی ئەوەی نەدەکرد کە ئەم هەموو خەڵکە زۆرە لەناوبەرێت وزیندەبەچاڵی بکات، بێنەوەی گوێ بە مەسەلەی ماف مرۆڤ و ئاین و یاسا بدات، ئەوکاتیش خەڵکەکە نەیاندەزانی ئەم تاوانە بەناوی (ئەنفال) هوەیە، کەس شارەزایی لەم بوارەدا نەبوو، باوکم و خزمەکان کۆبوونەوەو بڕیاریاندا بڕۆن بەرەو ژێر دەسەلاتی حکومەت،کەسیش بەخەیاڵیدا نەدەهات هەمووومان بکوژن، دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە حکومەت کۆمەڵگای زۆرەملێ دەکاتەوە، چونکە پێشتریش هەندێ کۆمەڵگای زۆرەملێ دروستکرابوو بۆ ئەوگوندانەی نزیك رێگا گشتیەکان و ژێر دەسەڵاتی حکومەت لەو کۆمەڵگایانە جێنشین کرابوون، خەڵکەکە پێشبینی ئەوەی دەکرد گەربچنەوە ژێردەسەڵاتی حکومەت ئەوکەسانەی کاتی سەربازیانە دەیانبەن بۆ سەربازی و ژن و منداڵەکانیش لە قەزای (خورماتوو) دەمێننەوە یان کۆمەڵگایان بۆ دروستدەکەن، یان دەڵێن بۆ خۆتان خانوو بگرن، ئیتر هەرگیز بیرمان نەدەکردەوە لەوەی کە کۆمەڵکوژیمان بکەن .لەرۆژی ١٩٨٨/٤/٨ باوکم و مام و پیاوانی ئاوایی کۆبوونەوە تەگبیربکەن و بڕیاربدەن چیبکەن؟دوای راویژ و مشاوەرە هەموو رێککەوتن بەرەو ژێر دەسەڵاتی رژیم بڕۆن، ئیتر کاتژمێر حەوتی ئێوارەی هەمان رۆژ ئامادەکاری کراوکەوتینە رێ بەرەوقەزای خورماتوو مەڕوئاژەڵەکانیشمان لەگەڵ خۆمان هێنا، لەکاتژمێر (١) ی نیوەشەو گەیشتینە گوندی (سەرشۆراو) بەهەموومان (١٠٠) کەس دەبووین، چەند ئامێرێکی تراکتۆرمان پێبوو هەندێ ماڵ و پێخەفمان لێبارکردبوون لەگەڵ ژن و منداڵەکان، چونکە بەشی ناکرد هەمووسوارببن ئەوانەی ئەیانتوانی بەپێ بڕۆن لەگەڵ مەڕو ئاژەڵەکان

دەرۆیشتن، بەبۆچوونی خۆمان خۆمان لەمردن رزگاردەکەین، چونکە ئەو شەوە هێزێکی زۆر ئامادەکرابوو بۆ پەلاماردانی ناوچەکە، نەمانزانی بە پێی خۆمان بەرەومەرگ دەچین،وەکو وتم کاتژمێر (١) ی شەوبوو گەیشتینە گوندی سەرشۆراو لەخوارگوندەکە جاش و سەربازەکان رێیان پێگرتین و نەیانهێشت برۆین، پرسیان بۆ کوێ دەرۆن؟ وتمان دەچینە خورماتوو خۆمان رادەستی حکومەت دەکەین، ووتیان نابێ بەم شەوە برۆن، سبەی بەیانی دەتوانن برۆن،باوکم و پیاوە ریش سپیەکان زۆر هەوڵیاندا وتیان خێزانمان لەگەڵدایە و ئاژەڵمان پێیە قبوڵیان نەکرد برۆین،ئێمەش ناچاربووین بمێنینەوە، ژن و منداڵەکان دابەزین لە تراکتۆرەکان. فەرهاد دەستی بۆ ئەو شوینە دریژ کرد کەدووبەردی گەورەی لێبوو ووتی: لەگەڵ دایکم و براوخوشکەکانم لەژێر ئەم بەردەگەورەیە خەوتین بەدڵنیاییەوە ئێرەبوو دایکم دایپۆشین چونکە پێخەفمان پێبوو بەهار بوو کەمێك ساردبوو، (٢٥) ساڵ بەرلە ئیستا لێرەبووین ئەگەر دوو (٢٥) ساڵی تریش بێمەوە ئێرە، هەر ئەم شوێنە دەناسمەوە، چونکە مرۆڤ دینارێك لە شوێنێ بزربکات کەبگاتەوە ئەوشوێنە دێتەوە بیری و چاوی بۆ دەگێرێ، من لەم شوێنە بەرەو چارەنوسێك دەڕۆم (٨) سەرخێزانم لێدادەبڕێ چۆن لەبیری دەکەم، جاش و سەربازەکانیش بەدەورمانەوە بوون، کە ڕۆژ بووە دیسان کەوتینە رێ بەرەو خورماتوو،هەرئەو بەیانیە کاتژمێر (٧,٣٠) خولەك گەیشتینە سەر روباری ئاوەسپی کەلەکەناری شارۆچکەکەوە تێدەپەرێت،سەرەتا وامانزانی بەس ئیمە هاتووینە بۆ خورماتوو، بەلاّم بینیمان خەڵکێکی زۆری تری گوندەکان لەوێن، دیاربوو پێش ئێمەش خەڵکی تریان گواستبووە بۆ (مرکزشباب) ەکە. کاتێ گەیشتینە سەرئاوەکە باوکم تێگەیشت کەدەستگیردەکرێن، چونکە لەوبەری ئاوەکە سەرباز و جاشەکان وەستابوون، ئۆتۆمبێلی سەربازیشی زۆری لێبوو، باوکم بانگی منی کردو وتی: فەرهاد تۆ گەورەتری لەمنداڵەکانی تر، ئەم ناسنامانەی خۆتان بالاتبێ هەندێ پارەو رادێۆکەشی دابەمن و وتی: ڕەنگە جارێکی تر یەك نەبینینەوە،

ئاگـات لـەدایکت و منداڵـەکان بێـت . منـیش لـێم وەرگـرت و چـووینە ئەوبـەری ئاوەکـە سـواری ئۆتۆمبیلەسـەربازیەکانیان کـردین، ئـەو هێـزەی ئێمـەیان بـرد سەرباز و جاشی تەواری بوون ئێمەیان بردە (مرکزشباب) ەکـەی خورماتوو کە شوێنی کۆکردنـەوەی گوندنشینەکان بوو، باوکم و براگەورەکەشم مانـەوە لای مەروئاژەڵەکان، کەئێمەیان گەیانـدە (مرکزشـباب) ە کە، دوای ئێمـەش تائێوارە خـەڵکیان دێنا،بـەڵام هـەمووی ژن ومنـداڵبوو، چـونکە پیاوەکانیـان دەبـرد بـۆ قوتابخانەی رەشید لای پردەکە، ئـەو نێرینـەیـەی تەمـەنی لەسـەروی (١٥) ساڵ بووایە بۆ ئەوێیان دەبرد. کاتێ لەگەڵ فەرهاد چووینە نـاو (مرکزشـباب) ەکە کە ئێستا هـەر بەکـەلاوەیی ماوەتـەوە، رێـك چـووینە ئـەو ژوورەی کـە فـەرهاد لەگـەڵ خێزانەکـەی لـێ زینـدانیکرابوون دەسـتی درێـژکرد بۆئەوشـوێنەی کـە خـۆی و دایك و خوشك وبراکانی لێبوون و وتـی: خـەڵکی ناوچـەی داودە ئـەوەی خـۆی رادەستی حکومـەت کردبوو هـەمووڵێرە کۆکرابـوەوە واتـە تـەنها ژن ومنداڵـەکان کـەمنیش یـەکێبووم لەومنداڵانـە، وەکـو وتم پیاوەکـان و گەنجـەکان برابـوون بـۆ (قوتابخانـەی ناوەنـدی رەشـید) .ئـەم ژوورەش مـاڵی ئێمـەو مـاڵی مـامم عـەلی و مامم حاجی عەزیز و ئافرەتـەکانیان و میمکە ئایـشە خـوا لێیخۆشبێت بردیانە گرتووخانەی نوگرەسەلمانیش هاتـەوە، دوایـی ئـەمری خوایکرد،هەرهـەموومان لێرەبووین، ئیتر رۆژانە خەڵکیان دەهێنـا بـۆ ئێرە،یەکەم رۆژ و دووەم رۆژ باش بـوو، بـەڵام دواتـرپێنج شـەش رۆژی پێـچوو (مرکزشـباب) ەکـە پربـوو، ئـەم باڵەخانەگەورەیـە.من ئـەوکات زۆر نـەخۆش بووم، ئـەو پیرێژنـە زۆر کەسـێکی بـەدین و خوانـاس بـوو دوعـای بەسـەرمندا دەخوێنـد ودەیـووت (الله خـير الحافظين وهو ارحـم الـراحمين) ، سـەیری کـوردی موسـڵمان بکـە لـەو رۆژەدا کە دوژمن عەرەب تۆ بەکافردادەنێت و ئـەنفالت دەکات،کەچی خەڵکەکە عەقیـدەی نـەگۆراوەو شـوکری خوادەکات و هـاواری بۆدەبـات. ئـەم شـوێنە زۆرپـیس بـوو بۆژیـان نـەدەگونجا، مـن کەسـم نـەبینی بمرێـت، بـەڵام هـەموو رۆژ خـەڵك بـاری تەندورسـتیان تێکدەچوو،چـونکە ئـەم شـوێنە زیـاتر لەدووهـەزارکەسـی لێبـوو،

جێنەمابوو، سەرەتا باش بوو، بەلاَم دواتر جێی خەوتن نەما هەرجێتدەبوووەوە بۆراوەستان یان دانیشتن، ماوەی حەوت رۆژ لەویٚ ماینەوە،هیچ خواردنیان نەدەدا پێمان تەنها کەس و کار و خزم خواردنیان بۆ دێنایـن، نەشیان دەهێشت کەس سەردانمان بکات، ئەو حەرەسانە کەپێکهاتبوون لەجاش و سەرباز و ئەمن و سریەێکی ئینزیباتی سەربازیشی لێبوونەوان زۆرباش بوون، لە پەنجەرەکەوە هەرجارەی کۆمەلێ مۆتەیان دەکردە ژوورەوە بۆ مندالەکان دەیانووت بیخۆن دلیان پێماندەسووتا،ئیتر دوای (٧) رۆژەکە واتە لە١٩٨٨/٤/١٥ کاتژمێر (٧) ی ئێوارە ئۆتۆمبێلێکی زۆریان هێنا،دوان سیانێ لەحەرەسەکان هاتنە ژوورەوە وتیان:پیاوەکانیانبرد ئێستا ئێوەش دەبەن، کەسیش نازانێ بۆکوێتاندەبەن، ئیتر هەرجارەی ناوی گوندێکیان دەخوێندەوە و بانگیان دەکرد، بەرێکەوت یەکم گوند بانگی (زینانە) یانکرد، یەکەم مالیش بانگی مالی ئیمەیان کرد، قسەکەی باوکم هاتەوە بیر کەلەسەرئاوەکە ماچمانیکردو وتی کوڕم رەنگەئێمە یەك نەبینینەوە ڕەنگە دیدارمان بگاتەوە قیامەت خۆزگا نەداهاتینەوە. وەك ڕۆژی حەشروابوو،ئیتر هیچ دەرفەتێکمان نەما،کاتێ سەرمانیان خستەناوپاسەکان من لەدووەم کورسی دوای شۆفێرەکەوە بووم، خەلکی شارەکەش زۆربوون کە بەدەوری پاسەکەوەبوون، ئەوکاتەش لەبیرمە دایکردەباران،ئافرەتێکی خەلکی گوندەکەمان لەدەرگاکەوە دابەزی و خۆی دەربازکرد، بەلاَم جاشێك گرتی و گەڕاندیەوە ناوپاسەکە،بەداخەوە من ئەوجاشە ناناسمەوە ئەگەربمناسیایەوە ناویم دەهێنا،لەوکاتە خەلکی ناوپاسەکە بەتایبەتی خوشکێکی باوکم هەموویان خوالێیانخۆشبێت،وتیان : (فەرهاد) تۆدابەزە خۆت دەربازبکە،منیش ویستم لەدەرگاکەوە دابەزم، بەلاَم کەبینیم جاشەکە نەیهێشت ئەو ژنە بڕوات، وتم تەواو ناتوانم لەدەرگاکەوە بڕۆم وتم لە پەنجەرەی پاسەکەوە خۆم فڕێدەدەمە خوارەوە، دایکم پێی وتم: کوڕم دانیشە مەڕۆ ژیانمان ژیان و مردنمان مردن، باپێکەوەبین، وتم دایە هەرئەڕۆم،یەکێ لە (ئینزیباتە سەربازیەکە) زۆر لێم

نزیکبوو هەریەك دوومەتر دووربوو لێم،من لەپەنجەرەی پاسەکەوە خۆم فڕێدایە خوارەوە، بەتەنیشت (ئینزیباتە سەربازیە) کەوە ڕۆیشتم هیچ دەنگی نەکرد، دیارە ڕەحمی خوا چووبووە دڵی،کە چومەناوئەو خەڵکەی وەستابوون بە دەورمانەوە کوڕێکی تریش ناوی (سالم) بوو ئەویش ڕایکرد، جاشەکان کە لەسەربانی باڵەخانەکەوەستابوون کە ئێمەیان بینی رامانکرد دەستیانکرد بەتەقەکردن، تەقەیەکی زۆریانکرد،بەراستی منیش ڕامکرد بۆناوخەڵکەکە، لەوکاتە دووکەس بریندار بوو، خەڵکەکەش خەریکبوون شوشەی پاسەکان بشکێنن. لەم کاتەی فەرهاد ڕوداوەکەی بۆم دەگێڕاوە هەردوکمان لەوشوینە وەستابووین کەفەرهاد لێوەی ڕایکردبوو رزگاریبوو دەستی بۆئەو کۆڵانە دریژکرد و هەمان جوڵەی ئەوکاتە یکردو کەمێك ڕایکردو وتی : هەرلێرەوە ڕامکرد لەم کۆڵانەوە،من قاپوتێکم لەبەربوو لەگەڵ قاتێکی کوردی، ئێمە (٣) برابووین باوکم زۆر خۆشی دەویستین (٣) دەست جلی کوردی بۆکردبووین لەگەڵ پشتێن وەك یەك، هەر لەناو کۆڵانەکە قاپوتەکەو پشتێن وبانقاتەکەم فڕێدا وتم با نەمناسنەوە ئەگەرهاتن بەدوامدا، بەسەروسیماشمەوە دیاربووکەخەڵکی گوندم و عەشایەرین ودیاریش بوو لە زیندان بووم و خەڵکی شارنیم، واتە منداڵێکی نامۆبووم بەوشوێنە، من هەستمکرد تەقەکان بەمنەوە دەنرێت، بەردەوامبووم لەڕاکردن، خۆم خستەماڵێکەوە، بەراستی لەناوکۆڵانەکە چەندماڵێك ویستیان من بشارنەوە،ئەوماڵەی کە منیانشاردەوە، ماڵی (حاجی مستەفا) بوو، ئافرەتەکانیان لەکۆڵانەکە جل و بەرگەکەیان کۆکردەوە و بۆمیان هێنایەوە،دواتر چوومەماڵی (حاجی عەلی) خەڵکی شێخان بوون، ئیتر منیان شاردەوە، کوڕێکی گەنجیان هەبوو، زۆر گریا بەسەر مندا،سەرەڕای ئەوەش زۆر دەترسان، پرسیاریان لێمکرد خەڵکی کوێی و لەکوێوەهاتووی،منیش هەمووشتێم بۆگێڕانەوە، وتیان ڕاستە سوپاو جاشێکی زۆر پەلاماری ناوچەی داویەیانداوەو شەرە،ئیتر وتم من ماڵی باپیر و نەنکم لە گەرەکی جەمیلەن نزیك ماڵی قادر خەیات، منیان بە تەکسیەك برد بۆ

ئەویٚ،بۆماوەیەك مامەوە لەویٚ، دواتر چووم بۆمالّی میمکم خوشکی باوکم هەرلەخورماتوو،مالّی مام خورشید کورەکانی کە میمکزام بوون (عادیل و کەریم و محمەد) ، زۆر بۆم باش بوون، ئەو میمکەم کەناوی (تەمارون) بوو بۆمن دایك وباوك و هەمووکەسم بوو تامردن لەبیری ناکەم ،خوالیٚیخۆشبیٚ لە ٢٠٠١ کۆچی دواییکرد، راستە خزمەکان زۆرینەیان بۆمن باش بوون، بەلاٌم هیچ کەس بە قەدەر ئەو میمیکەم بۆم باش نەبوو، ئیتر ژیانی من لەگەلٚ دابڕان لەخیٚزانەکەم، رۆژە رەشەکانم دەستی پیٚکرد، لەبیٚنازی دایك و باوك و خوشك و برا، هەندیٚجار لەناوکۆمەلّگای ئیٚمە کچ بەبیٚکەسی تووشی گیروگرفت دەبیٚ هەندیٚ جاریش کوڕ، من هەتا تەمەنی ١٠ و ١١ سالّی باش بوو چونکە مامەلّەی منداڵیٚکم لەگەلٚ دەکرا، بەلاٌم کە تەمەنم چووە سەروی ١٤ سالٚ و گەورە بووم ناکرا لەهەموو مالّك بمیٚنمەوە چونکە زۆربەی مالّەکان خاوەن ئافرەت بوون، گەورەبوونم بووە گرفت لەبەردەمم بۆمانەوەم لەمالّەکان، لەوسەردەمەش ناکرا ئیٚمەی ڕاکردو لە تاوانی ئەنفال بچینە دەرەوە و دیاربین یان بچینە بازاڕ یان هەرشویٚنیٚکی تر، چونکە دەسگیریان دەکردین ئەگەر بناسرایەین، چونکە ڕژیٚم دواتر هەولّیدەدا لەڕیٚی پیاوەکانیەوە لە ئەمن و هەوالّگریەکان زانیاری کۆبکاتەوە لەگەرەکە کورد نشینەکان، لەسەرئەوانەی لەپرۆسەی ئەنفال رزگاریان بووە، رژیٚم بڕیاریٚکیشی دەرکرد ئەگەر هەرمالّیٚك ڕزگار بوویەکی ئەنفال لەمالّیا دەستگیر بکریٚت، یەکسەر ئەومالّەشی پیٚوە ئەنفال دەکەن، واتە شویٚنبزریان دەکەن، تا (٣) مانگ هەربەردەوامبوون لە گەران بەدوای ڕزگاربووان، لە (١٤) ی تەمووز دەستیان کرد بەگەران و پشکنین بەسەرپەرشتی (عەلی حەسەسەن مەجید) بەراستی حەملەیەکی زۆر گەورەبوو، لە تکریتەوە هیٚزیٚکی زۆر زۆر هاتبوون، کە گەیشتنە (خوورماتوو) کەوتنە پشکنین بە دوای ڕزگاربووانی ئەنفال، کەچی خەلّکیٚکی زۆریان دەسگیر کرد لەپیاوەکانی خۆیان کە جاش و بەکریٚگیراوی خۆیان بوون، کە ژمارەیان زیاتر بوو لە هەزارکەس،بردیانیان لەتکریت زیندانیان کردن، دواى

ئەوە کەوتنە گەڕان بەدوای خەڵکی ڕزگاربوو لەپرۆسەی ئەنفال، ئەو ڕۆژە تووشی گێرو گرفتی زۆربووم چونکە دەچوومە هەرماڵێك دەریدەکردم، یەکێ لەوانە ماڵی خزمێکم بوو چوومەماڵیان خزمەکەمان ووتی : کاکە بۆخاتری خوا دەرچۆ بڕۆ،ئیستا پیاوانی ڕژێم بینە ماڵمان، تۆ نە ناسنامەت هەیە و دیاریشە منالی ئیمە نیت، نە ڕوخسارت لە منالەکانی من دەچێ بەخوا بتگرن ئیمەش ماڵمان وێران دەبێت، کردی بە قۆڵماو منی کردە دەرەوە، کەچوومە ناو کۆڵانەکە نەمزانی بۆکوێ بڕۆم، دەستم بەگریان و باوکەڕۆ کرد، بەراستی ڕۆژێکی تاڵبوو لەباسکردن نایەت، یاڕەبی ڕوو لەکوێبکەم ؟ بیرمکردەوە قەبرسانێك نزیکبوو لەوێوە، بچمە ناو قەبرسانەکە، کەچوومە نزیك قەبرسانەکە،سەیرمکرد جادەکان و تەنانەت ناو قەربسانەکەش هێزێکی زۆر زۆری لێیەو هەمووی گیراوە، جارجاریش بە بڵنگۆ بانگەوازی دەکرد کەس لەماڵەکان نابێ بێتە دەرەوە، منیش تەنها خۆم دەبینی لەجادەو کۆڵانەکان دەسوڕامەوە، دوعام دەکرد خوایە گیان ڕزگارمبکەی جگە لەخوا هیچ پەنایەکم نەبوو، لەوکاتە دایە ئایشە کە ئامۆژنم بوو هاتە ناو کۆڵانەکە بانگی کردم، وەکو فریشتەیەك فریام کەوت، بانگی کردم منیش خێرا ڕامکردە لای، دەستی گرتم ووتی:وەرە ڕۆڵە، هەرچەندە ئەویش نەیدەتوانی ڕزگارم بکات، بەڵام بردمیە ماڵێك، بەناوی مام (نەسرەدین خەلیفە) ووتی: ئەم منداڵەم بۆ بشارنەوە بانەیگرن. هەتامردن خۆم بەقەرزاری ئەو پیاوە بەغیرەتە دەزانم، لەوەلامدا وتی: بیهێنە وەلا خۆم و ماڵ و منداڵم بکوژن ناهێڵم ئەم منداڵە بگرن، یان دەبێ ئێمەش لەگەڵ ئەوبەرن یاندەبێ ئەویش دەستگیر نەکرێت، ئەمە تەنها هەڵویستی مام (نەسرەدین) نەبوو بەڵکو هەڵوێستی هاوسەر و منداڵەکانیشی هەروابوو،لەگەڵ منداڵەکانی ئەوان مامەوە، ئەوەندەمانزانی کۆمەڵێ لە پیاوانی ڕژێم خۆیانکرد بە ماڵی مام (نەسرەدین)، بەلام ماڵی مام (نەسرەدین) هەموویان زمانی عەرەبیان باش دەزانی و بەخێراتنی گەرمیان لێیانکردو قاوەو ماستاویان پێشکەشکردن و هەرئەوەندەو ڕۆیشتن، زۆر دڵم

خـۆش بـوو کـە ڕۆیـشتن ئـەوجارەش ڕزگـارم بـوو.  دوای هـەموو ئـەم دەردەسەریانە (فەرهادی تاقانە ) لەساڵی ١٩٩٣ ژیانی هاوسەری پێکدێنێت و ئیستا خاوەنی (٦) منداڵە، (٤) کچ و (٢) کوڕ بەناوەکانی (پەریخان – ژیان – رەیان – ئیمان – محمەد – ئارێن) ، بەڵام لەوماڵ و سەروەتە زۆرەی کەپێش تاوانی ئەنفال هەیانبوو تەنها رادێۆیەك ودەستێ جلی کەواو چاکەتی باوکی و ملوانکەیەکی دایکی بۆماوە، بەڵام زۆر دڵی پێیان خۆشەو پاراستوونی لە ماڵەوە وەکویادگاریەکی بە بەها.دوای ماندووبوونێکی زۆر و کە هەموو ئەو ویستگەکانەی فەرهاد پێیاتێپەری بوو بەسەرمانکردەوە هەرلە گوندەکەی خۆی تا کۆتایی ویستگەی دابڕانی لەخێزانەکەی، لەماڵەکەی (فەرهاد) دانیشتین و خستمانە بەردەم هەندێ پرسیاری ترکە کۆتایی ویستگەی چاوپێکەوتنەکەمبوو، لە وەڵامدا ووتی: ئەم ڕادێویە ئەو ڕادێۆیەیە وەکو ووتم کە باوکم لەگەڵ بڕێ پارە و ناسانامەی سەرجەم خێزانەکەم لەسەر ئاوەسپی پێیدام و ماچی کردین و وتی رەنگە نەتان بینەمەوە چاوت لەداکت ومنداڵەکان بێت چونکە من لەوان گەورەتربووم، رادێۆکەش بۆیە ماوە چونکە کاتێ خواردنیان بۆمان دەهێنا لەگرتووخانەی (مرکزشباب) ەکەی خورماتوو، خستمانە ناو قازانێك ناردمانەوە ماڵی میمکەکەم، دواتر لەوم وەگرتەوە، ئەم کەواو چاکەتەش هی باوکمە کاتی خۆی لەماڵ میمکم داینابوو ئەویشم لەو وەرگرتەوە، ئەم ملوانکەیەم هەرزۆر خۆش دەوێت هی دایکمە لەبیرمە پێش تاوانی ئەنفال بەماوەیەکی زۆر دایکم چوو بۆشار ئەم ملوانکەیەی کڕی. کەل و پەلێکی زۆرمان هەبوو باوکم لە خورماتوو لە ماڵە خزمەکان داینابوو، بەڵام لە ڕاپەرینەکەی ١٩٩١ کە ڕامانکرد کوردەکان هەمووی ڕۆیشتن شارەکەیان جێهێشت لەترسی سوپای سەدام، ئەو کەل و پەلانەشمان تالاًنکران.

فەرهادی تاقانە خیزانەکەی بریتی بوون لە (٩) کەس کە (٨) کەسیان لە تاوانی ئەنفال بێسەروشوێنکراون خۆی بە تەنها ماوەتەوە ئەمەی خوارەوەش ناوی ئەندامانی خێزانەکەیەتی :

١- رەشید ئەمین خەسرەو لەدایکبووی ١٩٤٧ باوك
٢- مریەم عەلی خەسرەو لەدایکبووی ١٩٤٢ دایك
٣- بەهجەت رەشید ئەمین لەدایکبووی ١٩٧٤ برا
٤- جەواد رەشید ئەمین لەدایکبووی ١٩٧٨ برا
٥- پەروین رەشید ئەمین لەدایکووی ١٩٨٠ خوشك
٦- نەسرین رەشید ئەمین لەدایکبووی ١٩٨٢ خوشك
٧- شەرمین رەشید ئەمین لەدایکبووی ١٩٨٤ خوشك
٨- عەدالەت رەشید ئەمین لەدایکبووی ١٩٨٧ برا

## شەماڵ محەممەد سابیر / تاقانەی ئەنفال



شـــەماڵ لـــەدایکبووی ســـاڵی ١٩٨٤ خـــەڵکی گونـــدی (ســـەرمۆرد) ناحیـــەی (ســـورداش) قـــەزای (دوکـــان) پارێزگـــای (سـلێمانی) ، کـاتێ تـاوانی ئـەنفالی یـەك لەرۆژی ٢٢لەسەر ١٩٨٨/٢/٢٣لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی وقەزای دوکان دەوروبەری دەست پێدەکات شەماڵ تەمەنی تەنها (٤) ساڵ دەبێت، بۆیە هیچی لەبیر نیە ئەوەی دێتەوە بیریشی تەنها وەك خەونێك وایە، تەنانەت شێوەی دایك و باوکیشی لەهزرو بیردانـــی نـــەماوە، دوای دابڕانـــی لـــە خێزانەکەی نەنك وباپیری بەخێوی دەکەن، واتـە ئـەوان جێـی دایـك وباوکیـان یـۆی پڕکردۆتـەوە، لـەم سـۆنگەیەوە هـەر پرسـیارێکم ئاراسـتەکرد بـەنازانم وەڵامـی دامـەوە، بۆیـە زیـاتر نـەمتوانی پرسیاری لێبکـەم چونکە لەگـەڵ پرسـیارەکان هەسـتمدەکرد دڵـی پردەبـوو و ڕەنگـی تێکدەچوو بەهۆی ئـەو خەمـە زۆرەی بـە ئاشـکرا بـە روخسـاریەوە دیـار بوو، ناحەقی نەبوو، چوونکە خەمەکانی زۆر گەورەبوون هەمووکەس بەرگەی ناگرێ، ئەو تەنانـەت تامـەزرۆی ئـەوە بـوو کـە شێوەی بـاوك ودایکـی لـە هـزری بمایەو جارجارە یادیانی بکردایەوە، ئەم چاوپێکەوتنەی من لەگەڵ (شەماڵ) لەناوکـــەلاوەکانی گونـــدی ســـەرمۆردبوو ئـــەو گونـــدەی کـــە (شـــەماڵ) ی تیالـەدایکبوو، بـەڵام شـەماڵ هـیچ یادگاریـەکی لەزێـدی خـۆی نـەبوو، چـونکە ئەنفال ڕێگربوو لەبەردەم یادگاریە خۆشەکانی لەگەڵ خێزان و کەس و کاری، هەرچەندە (شەماڵ) هیچی لەبیر نەبوو بەڵام کەمێك قسەی بۆکردین.

شەماڵ وتی: من وەك و خەونێك هەندێ شتم لەبیرە ئەوەی بیرم بێت ساڵی ١٩٨٨ ئێمە نەچوین بۆ ئێران، بەس مام و كەس وكارەكەم چوون بۆئێران دیارە بۆ خۆڕزگاركردن لەخوابەزیادبێ ئەوان نەكەوتنە بەرشاڵاوی ئەنفال، ئەوەم لەبیرە دوای تاوانی ئەنفال كەهاتنەوە منیان ئەبینی دەگریان و ماچیاندەكردم منیش نەمدەزانی مەسەلە چیە ؟ ئیتر منیش لێیانم پرسی مەسەلەچیە؟ وتیان تۆدایك و باوك وهەرسێ براكەت لە شاڵاوی ئەنفال شوێنبزركراون، هۆكاری ڕزگاربوونی من ئەوەبوو من نەخۆش بووم كەم لەماڵی خۆمان بووم بەردەوام دەچوومە ماڵی نەنكم و باپیرم چونكە من نەخۆش بووم پێویستم بە چارەسەر هەبوو لە قەزای دوكان و سلێمانی لەبەر ئەوە باوكم منی بردۆتە ماڵی باپیرم هەر لەبەر ئەوەش بوو من لەوان دابڕاوم و بەر شاڵاوی ئەنفال نەكەوتم، من شێوەی روخساری دایك و باوكم یان براكانم لەخەیاڵ نیە بەحوكمی ئەوەی زۆر منداڵبووم، دوای ئەنفالكردنی خیزانەكەم ئیتر هەرلای نەنك و باپیر و پورێكم گەورە بووم، منیش لە٦/١٠/٢٠٠٤ باپیرم مابوو خوازبێنی بۆكردم و هاوسەرگیریم كردووە و خیزانم دروستكرد و ماڵ و منداڵی خۆم هەیە لە ئۆردوگای (پیرەمەگروون) ژیان بەسەردەبەم و (٢) منداڵم هەیە. باپیرم و نەنكم دواتر كۆچی دواییان كرد خوالێیانخۆشبێت. ئەوەی یادگاری دایك و باوكم لەماڵەكمان بۆم جێمابێ تەنها رەگەزنامەیەكی باوكم و وێنەیەكی دایك و باوكمە كە هەمیشە دەیان پارێزم وەكو چاوم . ئەمەی خوارەوەش ناوی ئەندامانی خیزانەكەی (شەماڵ) ە كە لەشاڵاوی ئەنفال بزركران:

١- محەمەد سابیر قادر / باوكی

٢- مریەم محەمەد ئەمین / دایكی

٣- رەجەبەب محەمەد سابیر / برای

٤- هێمن محەمەد سابیر / برای

٥- شەهاب محەمەد سابیر / برای

## حەسەن عەلی فەرەج / تاقانەی ئەنفال



حەسەن خەڵکی گندی (ئۆمەربل) ناحیەی (سەرقەڵا) قەزای (کفری) یە، لە کاتی تاوانی ئەنفال تەمەنی ١٤ساڵ دەبێت بەڵام هەمووشتەکانی لەبیرە و زۆر بە سەلیقەو زیرەکانە ڕوداوەکان دەگێڕێتەوە، تەنەنانەت مێژووەکانیشی وەکو خۆی لەبیرە، تاوانی ئەنفال و دابڕان لەخێزانەکەی ئەوەندە کاریگەری لەسەرە لەکاتی گێڕانەوەی ئەم تاوانە، جارجار فرمێسکەکانی بەسەر ڕومەتەکانیەوە دەهاتە خوارەوە، منیش کەبەوشیوەیە ئەوم دەبینی لۆمەی خۆم دەکرد کەبۆچی برینەکانیم کولاندەوە، بەڵام ناشکرێ ئەم تاوانانەی بەسەر میللەتی کورد هاتووە کە زوڵمێکی بێهاوتایە، لە دژی کورد کراوە (دیکۆمێنت) نەکرێت، لە ناوگوندی (ئۆمەربل) و ناو ماڵەکەی خۆیان کە حەسەن هەرلە شێوازی پێشووتر دروستی کردۆتەوە، لەگەرمایەکی هاوینی گەرمەسێر دەستمکرد بە پرسیارکردن لەکاکە حەسەنی تاقانەو بەم شێوەیە وەڵامی پرسیارەکانی دامەوە،

حەسەن وتی :لەساڵی ١٩٨٧ لەژێر فشاری ڕژێمی بەعس ئێمە گوندەکەمان چۆڵکرد و ڕومان لە گوندەکانی دەوروبەرمان کرد،لە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٧ سوپای ئێراق دەستیکرد بەپەلاماردانی گەرمیان کەلەناوچەی قادرکەرەمەوە دەستی پێکرد لە رۆژی ١٩٨٨/٤/٨ دوو گولە تۆپی ئاراستە کردین کە لە خوار دێکە کەوت دوکەڵ چوو بە ئاسمانا خەڵکەکەی توشی

دڵـەڕاوکێکرد، چـونکە هـەموو وامـانزانی (کیمیـاوی) ە، بـەڵام دواتـر بۆمـان دەرکـەوت هـەر بـۆ دابەزانـدنی ورەی خەڵکـە و (کیمیـاوی) نیە،لـە بەرەبـەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٤/٩ سـوپای ئێـراق بـەهێزێکی زۆرەوە بـە هێـزە تایبەتیـەکی زۆرەوە بە چەك و تفاقێکی سەربازی زۆرەوە پەلاماری ئەم گوندەیدا، تا دوو ڕۆژێـك هەنـدێ ڕوبـەڕو بونـەوە هـەبوو لەگـەڵ پێـشمەرگەو خـەڵکی ناوچەکە،لەڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٠ خێزانەکەی ئێمەو خەڵکی ناوچەکە ڕویانکردە ناوچەی (زەنگنـە) و چـونە دێـی (لـەك) ی بەهجـەت قادرئاغا، منیش بەچەند قۆناغێـك ڕۆیـشتم تـا گەیـشتمە دێـی (قـەرە قۆچـاڵی) لـەوێ دایـك و بـاوکم دۆزیـەوە، تا شەوی ١٩٨٨/٤/١٤ ئەوشەوە دایکم (٤) دیناری داپێم باوکیشم بەرەحمـەتبێ (٢) دە دینـاری داپـێم واتـە (٢٤) دینـاری سویـسری، چـوینە سەرجادەی گشتی کەلار کفری لەو کاتە لەخوار جادەکە لەگەڵ دایکم و میمکم نـان و چـای نیوەڕۆمـانخوارد،دواتر ئـامرلیوای کـەلار و سـوپایەکی تایبـەت و گەلە جاشێك هاتن، سەرۆك جاشەکانیشیان لەگەڵ بوو دایکم و میمکمیان برد دایکم بەناوی (ئامینـە ئەحمـەد) میمکم بەناوی (سۆسـەن فـەرج) ، بردیانیـان خستیانیانە نـاو ئۆتۆمبێلێـك وبردیـانن بـۆ قۆرەتووکـە پێشتر بەشـەکەی تـری خێزانەکـەمان برابوونـە ئـەوێ، لەوکاتـە تراکتۆرێـك هـات پیـاوێکی خزمـان بـوو بەناوی (عومەر ساڵح فەرج) کەئەویش ئەنفالکرا،جا ئـەوەم لـەبیر چـوو لـەڕۆژی ٤/١٠ ماڵی (حاتـەم حاجی ڕۆستەم ) خواردنی نیوەڕۆیان بۆ ماڵی ئیمـەو (٣) ماڵی تر ئامادەکردبوو، بەڵام سوپا بەپێی نەخشەکەی خۆی لەپەلاماردا بـوو هەنـدێ هەلیکۆپتـەریش هاتبوونـە سەر دێـی (لـەك) ئەوەنـدە شـپرزە بووبـوون چێشتەکەیان لەسەر ئاگر بەجێهێشت بوو، من یـەکێ لە خوشکەکانم لەوێبوو بـەناوی (وەردە) لەگـەڵ نـەنکم کـە ژنێکـی بەساڵاچـووبوونەمە یەکێکـە لەگرێکوێرە دەرونیەکانم کە دەمـەوێت ئـەم قسەیەم وەربگێردرێتـە سـەر هـەموو زمانـەکان بەتایبـەتی ئینگلیـزی و عەرەبی،ئـەوکات وەکـو ئێـستائامێرەکانی پەیوەنـدی نـەبووە تـا پەیوەنـدی بکـەن، ئـیتر دایـك و بـاوکم زۆر خـەمیان بـۆ

خواردبوو،تـاڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٢ پـاش نیوەڕۆکـەی لەگونـدی (قەلآقۆچـاڵی) دۆزیبوویانـەوە ئەوەنـدە گریـابوو ئەوەنـدە فرمێسکی ڕەشتبوو، ئیمـە بـەزکماك هەسـتیاری چـاومان هەیـە ئـەلیٚ هەردووچـاوی بووبـوون بـەخوێن کـە دواتـر رزگاربووەکـان دەیانگێرایـەوە کـە هـەتا کـەمپی تـۆبزاوە و دووبـزیش هەرکاریگەری لەسەرچاوی هەبووە . من ئەوکات تەمەنم ١٤-١٥ ساڵبووم بەلاّم لە ڕووی جەستەییەوە لاواز و وردبووم چونکە منـداڵی واهەیـە ١٥ ساڵە، بەلاّم لەش و لاری گەورەیە، دوای ئەوەی لە دایکم و میمکم دابڕام هەرچەندە دواتـر میمکم رزگاری بوو لەنوگرەسەلمان سوپاس بۆخوا ئێستاش ماوە، من لەگەلٚ دوو کـوڕی ئـامۆزام مـەریوان و کامـەران و کـوڕێکی پـورزام بـەناوی کـەنعان ومامەسمایل و کاوەی برازای کەخزم و کەسی یـەکبووین لـە گوندەکە من (٢٤) دینـارم پێبـوو کەدایکم و باوکم پیانـدابووم، بەلاّم هاوڕێکانم هیـچیان پارەیـان پێنەبوو، ڕۆژێکیان سیٚ ئەفسەر هاتن وتیان جووتیٚ بەرخمان دەوێـت بـە (٤٥) دینـار هەریەکـەو بەرخێکمان گـرت بـۆ ئـەوەی پێـی بفرۆشـین، کوڕێکی ئـامۆزام وتـی: حەسـەن توخـوا ئەوبەرخـە بەردە تـۆ پـارەت پێیـە مـن هـیچ پـارەم پێنیـە، واتـە ئـەو بـەرخ بفرۆشـێت بـۆ ئـەوەی پـارە بێتـە دەسـتی، منـیش وتم باشـە، ئێمـەش (١٤) بـەرخمان داپێیـان بەهـەمووی (٤٥) دیناریـان پێمانـدا کـەمێك قسەمانرد لەگـەڵیان عەرەبیـشمان نـەدەزانی، خـاتری خـوا (خـاترالله) گـەورەم (سـیدی) و (ماسـوینا شـی) واتەهیـچماننەکردوە، ئـەو دووسـیٚ وشـە عەرەبیـەمان دەزانـی بـەحوکمی ئـەوەی مـن تـا چـواری سـەرەتایم خوینـدبوو و سنورەکەشمان نزیك بوو لەعـەرەب، ئیـدارەی حکومـەتی ئێراقیش هەرعـەرەبی بـوو چـەندجارێکیش سـوپای ئێـراق دەهاتـە گوندەکـەمان، چـەند وشـەیەك فێربووبووم،ئیتر (٩٠) دیناریـان داپێمـان و ڕۆیـشتن، لەوکاتـە مـام حەسـەنمان بینی کەبە ئەسلٚ خـەڵکی گوندەکەمانەو لەسەرقەلاّ دادەنیشت: وتـی: خـاتری خوا ئەوە ئێوە چیدەکەن لێرە ؟ ئیتر تـەگبیری بۆمـانکرد و شـەوەکەی ڕۆیـشتین بەچـەند قۆناغێـك، سـەرەتا چـوینە گونـدی (سـەید حوسـێن) سـەیرمانکرد،

سوپایەکی زۆر لەناوچەکەیە ئەوگوندانەی ئەوڕوخێنراون دەیانڕووخاندن، هەر چۆنێ بێت خۆمان حەشاردا، باش بوو ڕزگارمان بوو چوویینەگوندی عەلی خەلەف، ئیتر خاڵم عەبدولکەریم بەرەحەمەت بێت لەگەڵ حاجی شوکر یادی بەخێر کە هەر خەڵکی گوندی خۆمانە، هاتن بۆلامان حەیوانەکانیان بۆمان فرۆشت و ڕۆیشتین بۆ قەزای کفری بە حوکمی ئەوەی من کاتی سەربازیم نەبوو کێشەم نەبوو خۆشم دەپاراست ماڵی خاڵەکانم لە کفری بوو، ماڵی میمکم لە خورماتووبوو، ماڵی میمکێکی ترم لە سلێمانی بوو، دەڕۆیشتم بە حەفتەیەك دە ڕۆژ خۆم گوم دەکردو دەهاتمەوە کفری، بەردەوام خۆم لە چاوی جاشەکان و پیاوی حکومەت دەپاراست، تاکو لەرۆژی ١٩٨٩/٣/٢٥ ناوم هات بۆ سەربازی و بووم بە سەرباز، لەهەولێر و باشوری ئێراق سەربازیم کرد دەیانجار ناومیان دەخوێندەوە کە مۆڵەت دەدرام دەموت (شکرا سیدی مارید اجازە شسوی بالاجازە) واتە سوپاس گەورەم مۆڵەتم ناوێت چی لە مۆڵەت بکەم ؟، پسولەی مۆڵەتەکەم لەگیرفانم بوو هەرلە سەربازگەکە دەمامەوە هیچ ماڵ و شوینم نەبوو بۆی بچم لەکاتێکا سەربازەکانی هاوڕێم لەخوایاندەویست یەك ڕۆژ مۆڵەت بدرێن، لەسەر ئەو بەتانیە (پەتۆ) سەربازیە دەخەوتم بە خەیاڵ هەرجارەی لەگەڵ دایکم یان باوکم یان خۆشك و براکانم قسەم دەکرد جاروابوو هەرلەو خەیاڵە قسەم لەگەڵ باوکم دەکرد و دەستی دەهاورد بەسەرما، ئیتر بەدوومانگ و سێ مانگ لەو سەربازگەیە دەمامەوە لەگەڵ خەمەکانم دەژیام کەس نەبوو نازم بکیشێ لەڕوی دایك و باوکەوخوشك وبراوە، بۆیە بەناچاری هەرلەو سەربازگەیە دەمامەوە . حەسەن هەرلە گوندی ئۆمەربل لەحەوشی خانووەکەی خۆیان کە دوای ڕاپەڕین دروستی کردۆتەوە کاکە حەسەن کاتێ کە هەواڵم پێیدا من دێمە گوندەکەیان بۆ چاوپێکەوتن کۆمەڵێ جل و بەرگی دایکی و باوکی بەدیواری خانووەکەوە هەڵواسی بوو لە شێوەی پێشانگایەکی بچووك و وێنەی ئەندامانی خێزانەکەشی هەڵواسیبوو، پرسیارم لێی کرد ئەم شتانەچیە هەڵتواسیوون؟ ئەویش لەوەڵامدا وتی :

ئەمەوێنــەی باکمــە عــەلی حــاجی فــەرەج لــەدایکبووی ١٩٤٧ ئەمــەیان دایکمەئامینـە ئەحمـەد لـەدایکبووی ١٩٤١ ئەمـە خوشـکە گەورەکەمـە قەمـەر ئەمـەیان وەردەیـە کەلـە٤/١٠ ون بـوو لـە دێـی لـەك بۆمـاوەی دوو رۆژ، ئەمـە سەمیرەیە ئەوەی منی کوشتووە سەمیرەیە باوکم زۆر خۆشی دەویست حەزی لـەجلی کوڕانـەش دەکـرد، باوکیـشم دڵـی ناشـکاند بـۆی دەکـرد تەمـەنی (١١) سـاڵبووئیترنازانم ســەمیرەگیان تــۆ کــەجلی کوڕانــەت لەبــەر بــوو، کــاتێ گۆرەبەکۆمەڵـەکان هەڵدەدەنـەوە تـۆ لەگـەڵ پیاوەکـانی یـان ژنـەکان ؟ ئەمـەیان باوەژنەکەمە نەهیـەقادر خـەڵکی دێـی کارێزەی حەمەکەیفەیـە لە سـاڵی ١٩٨٤ هاوسـەرگیری لەگـەڵ بـاوکم کـرد بەرەزامەنـدی دایکـم چونکە تـەنها یـەك کـوڕی هەبوو کەمن بووم ئەمەش نەهیە گیانە لەگەڵ دوومنـداڵی ئـەنفالکراوە، ئەمـەیان حوسـێنی برامــە لــە ١٩٨٨/٦/١٥ لـەدایکبوو، ئەمــەیان پــەیمانی خۆشـکمە ١٩٨٧/٦/٦ لەدایکبووە (١٠) مانگ و شتێك بوو بەراستی شاعیر ئەڵێ: (منداڵ شیرەخۆر تەمەن وردەساڵ بەدایەدایە خرایـە ناوچاڵ) ، لێرە نوسیومە ئـەنفال ناسنامەمانە کـەدەبێ بیپـارێزین، ئـیتر ئـەم وێنانـە لـە بۆنـەکان هـەڵیان دەگـرم ئەوەنـدە بۆیـان دەگـریم خەریکـە خوێن لەچاوم دەردێـت چیبکەم سەبوریـشم پێیان دێت، من پۆلێك خوشـکم رۆیشتووە، زۆرجـار لەسـەر سفرەی نـانخواردن منداڵــەکانم دادەنیــشن (٥) منـداڵم هەیــە (٣) یانیـان کـچن زۆرجـار شـێوەی خوشـکەکانم لـە ڕوخـساری ئـەوان دەبینـم، بەتایبـەت (ئیمـان) ی کـچم زۆر لـە وەردەی خوشکم دەچێت، زۆرێك لەخزمەکانم وتیان ناوی لێبنێ (وەردە) وتم دڵـم قەناعـەت ناکـات جەڵتـە لـێم دەدات، زۆرجـار کـچەکانم لەبەرچـاوم دەبنـە خوشـکەکانم خوایـە ئەمانـە ئـەوانن؟؟؟ . حەسـەن بـەدەم هەڵکێشانی هەناسـەی قوڵـەوە بـەردەوامبوو لـە گێڕانـەوەی ڕابـردوی و ئـەو شـتومەکانەی کەبەشـێکن لـەیادەوەری بـاوك و دایکـی یــەك یــەك بەدەسـتیەوە دەگـرت و ڕونکردنـەوەی لەسـەر دەدان و وتـی: لـەم گونـدە یەکـەم کـەس بـاوکم تراکتـۆر و ئۆتـۆمبێلی کڕیـوە لەسـاڵی ١٩٨٠، ئـەم فۆسـفۆڕە سورە ئۆتۆمبێلەکەی پێڕازانـدبوەوە ئـەم

پارچە سوفەش هی سەرداشپوڵی ئۆتۆمبێلەکەی بوو، باوکم پیاوێکی قورئان خوێنیش بوو، گرنگی زۆریشی بە جل و بەرگی خۆی دەدا،یەکەم کەس بووە دیسداشەی کردۆتەبەر ئەم دیسداشەیە لەوسەردەمە زۆر جوان و سەردەمیانەبووە کە یەخەکەی زۆر جوان نەخشراوە، ئەمە کۆلوانەی دایکمە کە خستۆتیە سەرشان .هەرلە ناوشتەکان قورئانێک هەبوو کاکە حەسەن دەستی دایە قورئانەکەو وتی : زۆر بەداخەوە ولآتە عەرەبیەکان کە خۆیان بەموسڵمان دەزانی لەبەر بەرژوەندی خۆیان چاوپۆشیان کرد، لەو تاوانە گەورەیەی کە لەدژی کورد کرا، ئێمە کۆمەڵکوژی کراین بەناوی (ئەنفال) ەوە گوایە ئێمە بێدینین، ئەمە قورئانەکەی باوکمە کە زۆرجار سورەتی (الرحمن) ی دەخوێند، دەنگی زۆر خۆش بوو، ئەمە قاپووتی باوکمە سەیرکە چەند جوان و نایابە ئیستا لەهەمووبازارەکان قوماشی لەم شێوەیە نیە . لە ناوکەل و پەلەکان حەسەن دەستی برد بۆ پارچەقوماشێکی جوان کە نەدورابوو بەلآم یەکسەر دەستی کرد بەگریان و وتی: ئەمە منی کوشتووە بەراستی کاتێک کەباس لەم پارچە قوماشەدەکەم دەچمە دنیایەکی ترەوە، ئەمە یەکێکە لە قوماشەکانی دایکم بەداخەوە، رۆژێکیان دایکم چوو بۆشار پێش پیادەکردنی تاوانی ئەنفال بەماوەیەك، ئەم قوماشەی کڕی، زۆر دڵی پێخۆش بوو، بەلآم نەیدوری و لەبەری نەکرد، نەئەم قوماشەی لەبەرکرد نەکفن و نەخاکی کوردستانیش بووە نسیبی، ئەمە بۆیمەی دایکمە کە بەزەنگیانە نەخشراوە لەوسەردەمە ژنان لەسەریاندەکرد،ئەمەش پشتێنی باوکمە بزانە چەند جوانە، باوکم پیاوێکی دڵتەڕو ڕێك پۆشبوو، زۆر خزمەتی خۆی دەکرد و دەوڵەمەندێکی خواردەبوو، ئەگەر (١٠) کەس ڕێی بکەوتایە ئەم گوندە ئەگەر هەر (١٠) یان میوانی ئێمە نەبوایەن دەبوو لانیکەم (٧) یان میوانی ئێمەبوایەن، لە شۆڕشی ئەیلول بارەگای عەزیزقازی ڕەحمەتی لێرەبووە، وەکو بەتەمەنەکان دەیگێڕنەوە زۆربەی تێچوی ئەو بارەگایە لەسەرگیرفانی باوکم بووە، بەحوکمی ئەوەی حەزی بەکاری خۆبەخشی کردووە، دەوڵەمەندیەکەشی

چـيبوه؟ پــشتی بــه بــهخێوكردنی مــهڕومالأت و كــشتوكاڵكردن بهســتوه، ڕەزیشمان هەبوو كەهەمووجۆرەكانی میوەی تێدابوو .لەم حەوشەیەی ئێمە ( ٩) كەس لەسەر سفرەدادنیشتین لە و ( ٩) كەسە ( ٨) ی تیاچوو بەتەنها من ماوم، (٢٤٨) كەس لەم دێیەی ئێمە بێسەروشوێنكران لەتاوانی ئەنفال، لەوژمارەیە (٧٠) كەسیان كەس و كاری منە، ئەوەشمان لەبیر نەچێ نەنكم لە گرتووخانەی نوگرەسەلمان گەرایەوە بەلأم بەو كاریگەریەوە گیانی سپارد. ئەمەی خوارەوەش ناوی ئەندامانی خیزانەكەی كاكە حەسەنە كە لە تاوانی ئەنفال شوینبزركران:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١- عەلی فەرج كاكە خان | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٤٧ | باوك |
| ٢- ئامینە ئەحمەد بارام | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٤١ | دایك |
| ٣- نەهیەعەبولقادر | لە دایكبووی ساڵی | ١٩٦٨ | باوەژن |
| ٤- قەمەر عەلی فەرەج | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٧٣ | خوشك |
| ٥- وەردە عەلی فەرەج | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٧٥ | خوشك |
| ٦- سەمیرە عەلی فەرەج | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٧٧ | خوشك |
| ٧- حوسێن عەلی فەرەج | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٨٦ | برا |
| ٨- پەیمان عەلی فەرەج | لەدایكبووی ساڵی | ١٩٨٧ | خوشك |



ڕەمزیـــــەخان لــــە کــــاتی پیادەکردنی تاوانی ئەنفال تەمەنی (١٧) ساڵان بوە، چیرۆکی تاوانی ئەنفال لە گوندەکەیان و چۆنیەتی دابڕانـــی لـــە خێزانەکـــەی زۆر بـــەجوانی لـــەبیرە و وەکـــو خـــۆی ڕوداوەکـــە دەگێڕتەوە،لـــەوەڵامی پرســـارەکانم بـــەمجۆرەی خـــوارەوە درێژەی بە قسەکردن دا.

ڕەمزیـــە وتـــی: مـــن خـــەلکی گوندی (قەرەناو) م سەربە ناحیەی (شـــوان) پارێزگـــای (کـــەرکوك) حکومـــەتی بـــەعس پـــەلاماری گوندەکەمانیـــدا و ڕوخانـــدی ئێمـــەش بـــۆ خـــۆ ڕزگـارکردن ڕومـانکردە هـەردە و چـۆڵ و شـاخ، بـەڵام هەربەدوامانـەوە بـوون و دەورمانیـانگرت و هـەموومانیان دەستبەسـەرکرد، بەتایبـەت (شێخ سـەلاح) ی مـستەشار خـۆی و جاشـەکانی ئێمـەیان دەسـتگیر کـرد، خـاڵم کـەناوی (عـەلی ئەحمەد یاسین) ە خەڵکی گوندی (گردخەبەر) بە (شێخ سەلاح) ی مستەشاری وت: ئێمە چیمان لێدەکەن گـرنگ نیە، بـەڵام نـابێ ئەم کچانەبدەیتە دەست حکومەت، ئەگەر ڕزگاریان ناکەی گولەبارانیان بکە، خاڵم زۆر لێی دەپاڕایـەوەو بـەردەوام قسەی لەگـەڵ دەکرد،بـەڵام (شێخ سـەلاح) دەیـوت ناتانـدەینە دەسـت حکومـــەت مەترســـن هـــەر هـــەتا تـــۆبزاوەی خوارکـــەرکوك دەتانبـــەن هەنـــدێ پرسیارتان لێدەکەن و دێنـەوە هـەر پانزە ڕۆژێکتـان پێدەچێت، هـەوڵی ئەوەی دەدا خەڵکەکـە هێوربکاتـــەوە، ئـــیتر هـــەموو خەڵکەکـــەیان کـــۆکردەوە بـــەرەو

شارۆچکەی تەق تەق بردینیان بۆ سەربازگەی قەڵاتە کە گەیشتینە قەڵاتە ئێمەیان جیاکردەوە واتە کچەکان خستمانیانە ناو جێبێکی سەربازی بچوکەوە، خەڵکەکەی تریان سواری ئیڤای سەربازیکرد و ڕادەستی سەربازگەی قەڵاتەی کردن، پێشتریش هەرچی پارەو زێڕمان پێبوو (شیخ سەلاح) هەمووی برد گوایە بۆمان هەڵدەگرێت، میمکێکم دووکچی شوی کردبوو زێڕەکانیان لای ئەو بوو (شیخ سەلاح) ئەوانەشی برد، ئێمەیان لە ناو تەق تەق بەرەڵا کرد من سێ کچی خاڵم لەگەڵمبوون بە ناوەکانی (پەروین . پەرژین . نەخشین) ، من ماڵی مامێکم لە شارۆچکەی تەق تەق بوو چوومە ماڵی ئەوان، کچەکانی خاڵیشم چونە قەزای کۆیە ماڵی میمکێکیان لەوێ بوو خوشکی باوکیان، لەماڵی مامم مامەوە هەتا ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لەکۆڕەوەکە چوینە ئێران دوای ئەوەی گەڕاینەوە ئیتر من هاوسەرگیریمکرد، بەڵام ئەوماوەیە دەردەسەری زۆرم چەشت ژیانم زۆر ناخۆش بوو، نەباوك و نە دایك و نەبرا و نەخوشك کەسم نەبوو، مامەکەم بۆ منداڵەکانی خۆی باش بوو، بەڵام بۆمن وانەبوو بەتەواوی هەستم بەو جیاوازیە دەکرد، کاتێك من هاتمە تەق تەق پێڵاوێکی دڕاوم لەپێبوو سێ جار چوومە بازاڕەکە پارەم پێنەبوو جوتی پێلاو یان جوتێ نەعل بکڕم، ئەوندەم ناخۆشی بینیوە هەگیز لەباسکردن نایەت .

ئەمەی خوارەوەش ناوی ئەندامانی خێزانەکەی ڕەمزیەیە کە لەتاوانی ئەنفال بێسەروشوێنکران:

١. غەفور قادر محەمەد باوکی
٢. حوسنیە محەمەد یاسین دایکی
٣. بەشدار غەفور قادر برای
٤ . ڕێبوار غەفور قادر برای
٥ . زارا غەفور قادر برای
٦. شنۆ غەفور قادر برای



دوای ئـــەوەی خـــەڵکی ناوچـــەکە و گونـدی فـەقێ مـستەفا وەرس دەبـن لـە خۆشاردنەوە لەهەردەو دۆڵی ناوچەکە و بـارینی ترسـێکی زۆر و بـڵاو بوونـەوەی پروپاگەنـــدەکانی رژێـــم، کـــە گوایـــە کۆمـەڵگای سـەردەمی دروسـت دەکـەن بـۆ گوندەکان،خەڵکەکە بەناچاری گوندەکـەی خۆیـان بەجێـدێڵن، ماوەیـەك لـە هـەردەو دۆڵەکان خۆیان حەشاردەدەن بەڵام تـرس و دڵـە راوکـێ لەهێرشـی سـوپا و فرۆکـە ســەربازیەکان تــەنگ بــە خەڵکــە کــە هەڵدەچـنێ و ناچـار دەبـن بـەرەو قـەزای چەمچەماڵ بکەونـەڕێ، ئـەوەی هۆکـارێکی گواستنەوەی هەبووبێ وەك تراکتۆر هەندێ پێداویستی ناوماڵ لەگەڵ خۆیـان دەبەن و شوانەکانیش، مەڕو ماڵاتەکەیان دەخەنە ڕێ بەرەو قەزای چەمچەماڵ، (جـەمیل) یـش هەرچـەندە منـداڵ دەبێـت وتەمـەنی (١١) سـاڵ دەبێـت، بەڵام لـە دووبراکـەی گـەورەتر دەبێـت، بۆیـە لەگـەڵ ئامۆزاکـانی مـەڕو ئاژەڵـەکان دەبـەن بـەرەو چەمـچەماڵ، هەرچـەندە لەگوندەکـەی ئـەوان بـۆ قـەزای چەمـچەماڵ زۆر دوردەبێـت کەئێمـە لـەکاتی چـوونمان لەچەمـچەماڵەوە بـۆ گوندەکـە زیـاتر لـە دووکاتـژمێرمان پێـچوو، بـەڵام بەناچـاری ملـی ڕێگـا دەگـرن و دەڕۆن. لـەناو گوندی فەقێ مستەفا کە زێدی جەمیلە لـەماڵی خزمێکی جەمیل ماستاوێکی خەستمانخواردەوەو پشویەکماندا، ڕێك لەو شوێنەی کە پێش تاوانی ئەنفال

مـاڵی جـەمیل بـوو بـەڵام لەگـەڵ زەوی یەکـسانکرابوو کەیەکـەم وێـستگەی چاوپێکەوتنەکەم بوو بەدرێژایی ئەو ڕێگایەی کەجەمیل بڕیبووی لەگوندەکەی خۆیانـەوە تـا قـەزای چەمـچەماڵ هـەموو وێـستگەکانم بەسـەر کـردەوە دوا وێـستگەم مـاڵی حـەکیم ئاغـای هەمەوەنـدبوو لـە ئۆردوگـای پیراییـەکان لـە چەمچەماڵ کە کۆتایی جار جەمیل لەماڵی ئەوان گیرسابوەوەو زۆر لێیـان ڕازی بوو،ئەمەی خوارەوە پوختی وەڵامەکانی بوو.

جـەمیل وتـی: نـاوم (جـەمیل محەمـەد ئەحمـەد) ە خـەڵکی گونـدی فـەقێ مستەفام کەسەربە ناحیەی قادرکەرەمە لە پاریزگای کەرکوك. ئێمە لە دێکەی خۆمـان دانیـشتبوین خـەریکی جوتیـاری و مـەڕداری بـوین، دەنگوباسـی ئەوەهـەبوو کـە ڕژێـم پـەلاماری ناوچـەکەدەدات، پـیش دێیەکـەی ئێمـەش گوندەکانی (مەسۆیی) کە چوار گوندن ئەنفالکرابون، لەگەڵ گوندەکانی داویەو دەوروبـەری بـە سەرپەرشـتی تاوانبـار (بـارق حـاجی حنتـە) بۆیـە ئێمـەش زۆردەترسـاین، ناچـار بـوین خۆمـان بگێنینـە ناحیـەی سـەنگاو پێمـانوابوو ئەگەربچینەئەوێ ڕزگارمان دەبێت، بۆیە مەڕومالاَت و هەندێ بەتانیمان لە ولاَغ بـارکرد، ماڵەکـەمان هـەمووی جێهێـشت کەوتینـەڕێ، مـن لەگـەڵ ئامۆزاکـانم مەڕەکانمانبرد، خەڵکەکەش لەپێش ئیمەوە ڕۆیشتن ، هەرئەوڕۆژە دوای بانگی ئێـوارە گەیـشتینە گونـدی (سـەرقەلاَ) کـەنزیك (ناحیـەی سـەنگاوە) ،خـەڵکی گوندەکـە خۆیـان لـەوێ نـەمابوون . لەگـەڵ جـەمیل کـاتێ گەیـشتینە ناوگونـدی (سـەرقەلاَ) و ڕێـك بـەردەم ئـەو ژوورەی کـە مـاڵی جـەمیل لێـی گیرسـابوونەوە هەرچەندە ئەم گوندە تەخت و خاپورکرابوو لەکاتی ئەنفال بەڵام دوای ڕاپـەڕین جارێکی تـر هەنـدی لـەخانووەکان دروسـتکرابونەوە، دایکـی جـەمیل خـواردنی دروسـتکردبوو وەکـو خـۆی دەڵـێ مریـشکی لێنـابوو، جـەمیل سـەیرێکی دەورو بـەری خـۆیکردو وتـی: بـەڵێ ڕێـك ئێرەبـوو دنیـا تاریـك بـوو بـوو ئێمـە بەمەڕەکانـەوە گەیـشتینەوە لایـان، دایکـم جێـشتی مریـشکی لێنـابوو دایکـم

خـواردنی بـۆم دانـا دوای نـانخواردن وتم دایـە کواخوشـکەکەم وبراکـانم؟ حەزدەکەم بیانبینم، دایکم وتـی:کوڕم ئـەوان مانـدون نوسـتون کـە گەیـستینە چەمـچەماڵ لـەوێ یەکدەبینینـەوە، منـیش دڵـم نـەهات خەبـەریان بکەمـەوە.
جەمیل بەردەوامبوو لەقسەکردن پێدەچوو دیمەنەکەی هاتبیتەوە بەرچاو بۆیە لـەناکاو دایەقوڵپـەی گریـان زۆر بـەکوڵ گریـا، ئیمـەش لەگـەڵی گریـاین بەدەمگریانەوە وتی ئەوە کوتایی دیدارم بوو لەگەڵ دایك و باوکم ئیترجارێکی تر ئەوانم نەدیـەوە، پـێش ئێمـە دیاربوو خـەڵکی گونـدەکانی تـریش هاتبونـە ئەوشوێنە، سەربازەکانی ڕژێم لەوێ ڕێگایان لێمان گرت نـەیان هێشت بچینە سەنگاو وتیان لێرە بمێننەوە تاسبەی، بۆماوەی سـێ ڕۆژ ئێمـەیان لـەوێراگرد، خەڵکەکـە زۆر بێـزار بـوون دوای سـێ ڕۆژەکـە ئەفـسەرێکی ئێراقـی هـات کـە وەرگێڕی کوردی لەگـەڵ بوو، وتـی عائیلـەکان بالێرە بمێننـەوەو شوانەکانیش مەڕومالات بەرن بەرەو چەمـچەماڵ کە لەگـەڵ شوانەکان کەوتینـەڕێ دوو کوڕی مـامم کەلەگـەڵ مـەڕەکان دەرۆیـشتن بۆ چەمـچەماڵ، هەرچـەندە ئەوکات مـن زۆر منـداڵ بووم بـەلام کوڕەکـانی مـامم وتیـان بـا ( جـەمیل) لەگـەڵ ئێمـەبێت، بـاوکم وتـی ( جـەمیل) نـابێ بێـت لەگـەڵتان چـونکە زۆر منداڵـەو لـەخۆم جیـای ناکەمەوە،بەلام کوڕەکانی مـامم وتیـان هـەردەبێ بێت لـە گـەڵمان ئێمـە ئاگامـان لێی دەبێت، هەرچۆنێ بێت باوکمیـان ڕازیکـرد کـەبڕۆم لەگـەڵیان، کەوتینە ڕێ لـە باسـەڕەوە سـێ ڕۆژ ڕێمـانکرد بـەرەو چەمـچەماڵ وپیرایـی، لـەڕێ زۆر ناخۆشبوو نانمـان پێنـەمابوو جگـە لەمـەش عەسکەرەکان بەدرێـژایی ڕێگاکـە دەکەوتنە ناو ڕانە مەڕەکەو بەکەیفی خۆیان کام مەڕباشبوو دەیانبرد، ئێمـەش نەماندەوێرا دەنگ بکەین چونکە دەیانگوت (بارق) چەندین ڕانە مـەڕو شوانی بردووە. کەگەیشتینە شیوە سوری نزیك پیرایی پێش چەمچەماڵ قەسابەکان و ئەوانەی خەریکی کڕین و فرۆشتنی مـەڕومالات بوون هاتنە پێشمان پێمانیـان دەگـوت ئێـستا (بـارق) دێـت دەتانبـات بۆئـەوەی مـەڕەکانیان بـە هـەرزان

پێبفرۆشین ئێمەش زۆر ماندو و شەکەت بوین زۆریش دەترساین نەماندەزانی چیبکەین ناچار جوتی مەڕو بەرخمان بە (١٥) دینار دەفرۆشت. سەبارەت بەوەی کەس یارمەتیدابن ؟ جەمیل دەڵێ : نەوەڵا سەرەڕای ئەوەی کە یارمەتی ئێمەیان نەدەدا کەچی تەعەداشیان لێمان دەکرد جاشەکان دارکاری شوانەکانیان دەکردو مەڕەکانیان دەبردو شوانە کەشیان دەدا دەست عسکەری،من لەبەرچاوی خۆم جاشم بینی کەشوانی دارکاری دەکرد وەکو (رەحمانی مام حەسەن) کە خەڵکی گوندی کۆییە، یەکێبوو لەو شوانانەی جاشەکان تەعزیبیاندا دوایش مەڕەکەیان بردو خۆشیان دایە دەست سوپای ئەنفالچی. منییش دوای ئەوەی مەڕەکانم فرۆشرا پورێکم لەگەڵ خاڵم هاتبون بۆ سۆراغی من منیان لەگەڵ خۆیانبرد بۆ سلێمانی بۆ ماڵی خۆیان لای ئەوان مامەوە تا یەك مانگ بەعسیەکان جاڕیاندا بەناو شاردا، ئەگەر هەرکەسێ گوند نشینێك لەماڵی بگرن ئەوانیش ئەنفال دەکەن، بۆیە خاڵم ناچار بوو منی برد بۆ ئۆردوگای باینجان لەوێ منی کردە شوانی ماڵێك بەبێ مقابیل خاڵم وتی: با ئەم کوڕە لاتانبێت بەس بۆئەوەی نەیگرن بۆماوەی سێ مانگ لەوێ مامەوە دوایی لەبەر ئەوەی مەرکەزی پۆلیس و ئەمنەکان نزیکیان بوو ماڵەکە بە خاڵمیان وت: جەماعەتی مەرکەزەکە وەك بڵێی هەستیان پێکردوە واباشە کوڕەکە ببەیتەوە، بۆیە خاڵم منی بردە چەمچەماڵ لە ئۆردگای قادرکەرەمیەکان لەوێ کردمی بەشوانی ماڵی حەکیم ئاغا تا ساڵی ١٩٩١ لای ئەوان مامەوە بەڵام دەمەوێ ئەوە بڵێم کە حاجی حەکیم ئاغامنی زۆر خۆشدەویست و پێش منداڵەکانی خۆی جل وبەرگ وپێداویستیەکانی بۆمن دەکڕی منداڵ زۆر حەزی لەپایسکیلە دووانی بۆمن کڕی بوو، خێزانەکەی جێگای دایکمی گرتبوەوە کوڕەکانی بووبوون، بەڵام بێ جیاوازی، بۆیە تا مردن لەپیاوەتی ئەو دەرناچم. سەبارەت بەسۆراغی دایك و باوك و خوشك و براکانی (جەمیل) دەڵێ : کاتێ ئێمە لە گوندی (سەرقەڵا) جیابوینەوە ئیتر من



ئەوانم نەدیەوە کە ئەو کات تەمەنم (١١) ساڵ بوو هەرئەیان وت بەردەبن تاکو ئێستا هەر چاوەڕێم، بەڵام دوای نەمانی رژێمی سەدام کە گۆڕە بەکۆمەڵەکان دەرکەوت زانیم ئەوان سەفەری مەرگیانکردوە. دوای ساڵی ١٩٩١ یش واتە دوای راپەرین بوم بە پێشمەرگە لە هێزی بەردە قارەمان تاکو ئێستا پێشمەرگەم. لەساڵی ١٩٩١ یش ژیانی هاوسەریم پێکهێنا و دوو منداڵم هەیە بەناوی (هێلین و بیلال ) و لە قەزای چەمچەماڵ ژیان بەسەردەبەین. (جەمیل) سەبارەت بەژیان و مەسەلەی قەرەبوو دەڵێ : من ژیانێکی زۆر ناخۆش و دەردەسەریم بردەسەر، دوور لەنازی دایك وباوك و کەس و کارم، نەژیانم قەرەبوو دەکرێتەوە و هەموو ئێراقم لەسەر تاپۆبکەن ناکاتە ئەوەی یەك جار بڵێم بابە یان دایە یان ئەو ساتانەی لەگەڵ برا و خوشکەکەم لەدامێنی گوندەکەمان یاریماندەکرد، بەڵام ئەوەی دڵخۆشمدەکات کەسەدامم بینی بەو شێوەیە رسواکرا وبە زەلیلی دەرکەوت، لە داهاتوشدا خوازیارم هەموو ئەوانەی دەستیان لە ئەنفال هەبووە سزا بدرێن، حەزدەکەم ئەوەش بڵێم

هەرکاتێ کەباسی حکومەتی بەعسیاندەکرد زۆر دەترساین، بەلاّم دوای ئەوەی سەدامیان بەو شێوەیە گرد وەکو کەسێکی ترسنۆك و بێ غیرەت، من خەفەتی ئەوەمە ئەو ترسنۆکە دایك و باوك و خوشك و براکانمی لەمن بزرکردو ئەو هەموو خەڵکەی ئەنفالکرد.

ئەمەی خوارەوەش ڕیزبەندی ناوی خێزانەکەی جەمیلە کە هەموویان لەتاوانی ئەنفال بێسەرو شوێنکران:

١- محەمەد ئەحمەد عەزیز لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٦ باوك
٢- حەیات حەمەکریم عەلی لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٠ دایك
٣- نەرمین محەمەد ئەحمەد لەدایمبووی ساڵی ١٩٧٨ خوشك
٤- کامەران محەمەد ئەحمەد لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٠ برا
٥- نازم محەمەد ئەحمەد لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٣ برا

## مەریوان عەبدولقادر ساڵح / تاقانەی ئەنفال



مەریوان ئەو منداڵەی کەتوانی لە قورگی تاوانی ئەنفال لەناو قشلەی کۆیە خۆی رزگاربکات، ئەوکات تەمەنی لە نێوان ١٢ـ١٣ ساڵدەبێت، لەگەڵ خێزانەکەی لەگوندی قەسرۆك دەژین، کاتێ پەلامارەکانی ئەنفالی چوار لە ١٩٨٨/٥/٣دەسپێدەکات لەبازنەی چەمچەماڵ وقەلاَسێوکەو شێخ بزێنی و شوان و ساڵەیی بەدرێژایی سنوری زێی بچوك لەو بازنەیە گوندی قەسرۆکیش دەکەوێتە بەرپەلامارەکانی ئەنفال، بەهۆی بۆردومان و ترس و دڵراوکێ،بۆ خۆ دەربازکردن خەڵکی ناوچەکە پەنابۆ دۆڵ و حەشارگەو ئەشکەوتەکان دەبەن لەبناری چیای خاڵخالاَن، هەرچەندە ئەوناوچەیە ناوچەیەکی چڕەو ئەستەمە سوپای ئێراق بتوانێ خەڵکەکە بدۆزێتەوە، بەلاَم بەچاوساغی چاشەکان وەکوسورەی بەرلەشکر، هەموو ئەو خەڵکانە دەدۆزرێنەوەو ڕادەستی سوپای ئێراق دەکرێن. لەسەرەتای مانگی پێنج کە کۆتایی بەهارە لەوناوچەیە لەگەڵ مەریوانی تاقانە لەوشوێنەی کەدەسگیرکران لەدۆڵێکی چڕ و پڕی پاش بەهارە، لەدامێنی چیای خاڵخالاَن داوام لەمەریوان کرد، چیرۆکی دەسگیرکردنی خۆی و خێزانەکەی و ئەوخەڵکەی لەوێبوون بۆم بگێڕێتەوە، مەریوان بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەرهاتی خۆی بۆمان گێڕایەوەو وتی:

من ساڵی (١٩٧٥) لەگوندی (تاڵەبانی گەورە) ی سەر بەقەزای کۆیە

لەدایك بووم، گەر ژیانی خۆم باس بكەم وەك مرۆڤێكی بێبەش لەهەموو تروسكەیەكی هیواو ئومێدو ئایندەیەكی گەش......هتد، هەر زوو گوندەكەمان بەبیانوی دەڤەری ستراتیژیو بوونی نەوت تێكدرا، لە ساڵی ١٩٧٩ بۆ شارۆچكەی (تەقتەق) ڕاگوێزراین.

دوای (١٠) ساڵی بێكێشەو گیرو گرفت، بەمەبەستی بژێوی ژیانو كارو كاسبی، بەماڵەوە لەبناری (خاڵخالان) چووینە گوندی (قەسرۆك) ولەوگوندە گیرساینەوە، كە پێش شالاوی ئەنفال دانیشتوانەكەی نزیكەی سەد خێزان دەبوو.

حكومەتی بەعس مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٨ بەسەرپەرشتی راستەوخۆی لیوا (بارق) و جاشە بەكرێگیراوەكانی كە كوردبوون، بەرنامەی پەلامارەكانیان قۆناغ بەقۆناغ دەستپێكردو هێرشەكانیان بۆ سەر گوندەكانی (قەرەناو، قامیشە، قوودرەتە، دارئەختیار، قەسرۆك) هێنا.

خەڵكی ئەمگوندەو گوندەكانیترحەوانەوەیان لێهەڵگیراو هەمووان لەپێناو قوتار بوونو خۆ رزگاركردن لەمەرگو ئەشكەنجەو ئازاری ئەو پرۆسە درندەیی هەمیشەی رژێم پیادەیدەكرد، گوندەكەمان چۆڵكردو هانامان بۆ دۆڵ و هەردەو ئەشكەوتەكانی بناری خاڵخالان بردو توانیمان دە رۆژ لەدۆڵی شیوەقولە بگوزەرێنین،خەڵكی گوندەكانی تریشی لێبوو ئیتر خواردنمان تەواو بوو،نەشمان دەتوانی بچینەوە گوندەكە لەبەرئەوەی سوپا گەمارۆی گوندەكان و ناوچەكەیدابوو گوندەكانیشیان خاپوركردبوو و سوتاندبوویان، وەزعێكی زۆر ناخۆش بوو منداڵ لەبرسادەگریا،ژن هەبوو لەوێ منداڵی دەبوو بیخواردن و هیچ پێداویستیەك، خەڵكەكە كەوتنە جوڵە ئەختیاری واهەبوو نەیدەتوانی بڕوات لەژێرداریك جێدەما،رۆژێك پێش دەسگیركردنمان ژنێك كوژرا بەگولەی سوپا، سوپا كەوتبونە پشكنینی ناوچەكە بەچاوساغی چاشە خۆفرۆشەكان، ئەگەر چاش نەبوایە ئێمەیان نادۆزیەوە چونكە ئەوشیوە شوێنێكی عاسیە،

ئێمەیان دۆزینەوە کاتژمێر (٢) ی پاشنیوەڕۆبوو،بەلاّم هەندێك لەو خەڵکە توانیان ڕابکەن خۆیان دەربازکرد،

ئەوەی لەوێبوو هەمووشانیان دەسگیرکرد، وتیان بابە ئێوە چیدەکەن لێرە؟ خۆئێمە هیچتان لێناکەین لەتەق تەق ئازاتاندەکەین، خەڵك باوەڕی پێیانکرد، نەیاندەزانی بەرنامەی کۆمەڵکوژیان بۆدانراوە، ئێمەیان بردەوە بۆ گوندەکە هەر بەپێ دەرۆیشتین نەماندەتوانی بڕۆین لەبرسان بەتایبەت منداڵەکان، من هەموو پێم و لاقم بووبوو بەدڕك، کەگەیشتینەگوندەکە بینیمان بەشۆفەلو TNT تەواوی گوندەکەیان خاپوورو بەسەریەکدا ڕووخاندبوو و دەسوتا. لەوکاتەی مەریوان باسی ڕوخان وسوتاندنی گوندەکەی دەکرد،لەگەڵ مەریوان لەناوەڕاستی گوندەکە وەستابووین لەژێر سێبەری دارێکی گەورە، دیاربوو ئەمدرەختە ئەنفال کاری تێنەکردبوو هەربەسەربڵندی مابووەوە،دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ یش چەند ماڵێك گوندەکەیان ئاوەدانکردبووەوە، هەرچەندە هێشتا زۆرێك لەخانووەکان وماڵەکان بە وێرانکراوی مابوونەوە، چونکە زۆرێك لە خانەوادەکان کەسیان لەپاش جێنەماوە لەدوای پیادەکردنی تاوانی ئەنفال،زۆربەشیان لەشوێنەکانی تری کوردستان گیرساونەتەوەو هۆکاری زۆریان هەیە بۆ نەگەرانەوەیان بۆ گوندەکە،مەریوان ئاورێکی لەمزگەوتی گوندەکەدایەوەو وتی: بەچاوی خۆم بینیم مزگەوتەکە کەبەتەواوی وێرانکرابوو هێشتا دووکەڵ و ئاگری مابوو قورئانەکانیش لەناو بڵێسەی ئاگردا دەسوتان،کەچی ئێمەش لەژێرناوی (ئەنفال) کۆمەڵکوژی دەکراین، بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکمان کردبێت، گوایە ئێمە کافرین و ئەوان موسڵمانن،ئاژەڵ و پەلەوەری گوندەکە هەمووی بلاّوبووبوونەوە بەبێخاوەن، سەربازەکان دەیانگرتن و سەریان دەبڕین و دەیانخواردن، ئەم درختەی ئێمە لەژێری وەستاوین کەلەشی ئاژەڵیان لێهەڵواسی بوو وەك ئەوەی حەلاڵی خۆیان بێت. ئێمە (١٥٠) خێزان لەیەك

شوێن‌و جێگەیان خڕکردینەوە، یەك لەو خێزانانەماڵی ئێمە (دایك‌و باوك‌و پێنج خوشك و دووبرا) م بووین. هەر ئەوکات پیاوەکانیان لە ژن‌و منداڵەکان جیایانکردنەوەو بە (٩) زیلی داخراو بەرەوتەق تەق بردمانیان.لەگەڵ مەریوان لە کۆتایی شارۆچکەی تەق تەق ڕووەو کۆیە وەستابووین نەبارانێکیش دەباری مەریوان هێمای بۆ سەر ڕێگاکە کردو وتی: کە گەیشتینە ناو تەق تەق کەمێك کاروانەکە وەستا،کاك (خەلیل) لە ئۆتۆمبێلەکە خۆی فڕێدایەخوارەوەو ڕایکرد، بەڵام دەستڕێژی گولەیان لێیکردو دەسگیریانکردەوە، دواتریش بەرەو مەنزومەی کۆیەیان بردین،کە گەیشتینە ناوکۆیە دیسان (خەلیل) ڕایکرد، شەوبوو ئەمجارەیان ڕزگاریبوو ئەویش لەخێزانەکەی هەرخۆی دەربازبووەو تاقانەی ئەنفالە،کە گەیشتینە ئەوشوێنەی ئێمەیان لێی زینداننیکرد وەك تێبینیمان کرد نزیکەی (٦٠٠ تا ٧٠٠) کەسی تری لێبوو لەخەڵکی ناوچەکە. سەرجەم پیاوەکانیان لەهۆڵێکی تایبەت ئاخنی‌و ژن‌و مناڵەکانیشیان فڕێدایە هۆڵێکی ترەوە بەڵام دەرگاکانیان لە ئێمە دانەخست وەك پیاوەکان.

من ئەو دەم بەهۆی بچووکی تەمەنەوە کە (١٣) ساڵبووم منیان نەبردەلای پیاوەکان، لەگەڵ دایکم مامەوە. بەچاوی خۆم ئەمبینی، سەربازەکان چۆن‌و بەچ شێوەیەك مامەڵەیان دەکرد و بە چ چاوێکی سووکەوە سەیری ئەو خەڵکەیان دەکرد،تۆزقاڵێك چیە؟ هەستی سۆزو بەزەییان لانەبوو،سەرەڕای ئەوەی ئێمە پێشتر برسیمانبوو تاچوار ڕۆژ خواردنیان نەدایىنێ ئەگەر هەشبوایە پاشماوەی خۆیانبوو، ژن ومندالێ لەبرسا زیرەیاندەهات، کەچی سەربازەکان دەهاتن گاڵتەیان لەگەڵ ئافرەتەکان دەکردودەستیان بۆدەبردن، ئافرەتێکمان لەگەڵ دابووبەناوی (ئامینە عەلی سادق) هەشت ساڵبوو هاوسەرگیری کردبوو منداڵی نابوو،لەوکاتە دووگیانبوو لەسەرمناڵ بوون بوو، بە هۆی ژانی منداڵبوونەوە هاواری ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت،هیچ پێداویستیەکیشی لێنەبوو تەنانەت پارچەیەك قوماشیشی لێنەبوو،ئەم ژنە لە

ژوورەکـەی ئێمەبوو،هەرچـۆنێکبێت ژنـەکان دەوریـان لێیداومنداڵەکـەی بـوو، ئەمـەش ئـەو دیمەنەیە کـەتاڕیان مـاوە لـەپێش چـاوم وون نابێت،برسـێتی زۆر تـینی بۆهینـابووین، بـەلاّم دواتـر دانیـشتوانی شـاری کۆیـە زانیبویـان کـە خـەڵکێکی زۆر لێـرەین لەمزگـەوتی گەورەبانگـەوازکرابوو بۆیـە خـەڵکی کۆیـەخواردن و شـیر و مەمـەی منـداڵیان دەهێنـا لەبـەردەم دەرگاسـەرەکیەکە دایانـدەنا و هەنـدێ لەسـەربازەکان خوارنەکـەیان دەهـاوردە حەوشـەکەوە، ئێمەش دەمانبردو دەمانخوارد، هەندی بوژاینـەوە، پێشترمنداڵ هـەبوو لەبرسا دەبوورایەوە،بەراسـتی خـەڵکی کۆیـە خزمـەتێکی زۆریـانکرد هەرچـەندە نەیانـدەویرا لەوشـوێنە نزیکبنـەوە، بـەلاّم خواردنیـان هـەردێنا بـۆ نزیـک دەرگاکە،ئـەو شـوێنەی ئێمـەی تیابـەنکرابووین بەرامبـەر شـوێنی پیاوەکـان بوو،کە ئەوانیان دەبرد بۆ سەرئاو باوکم دەبینی،زۆرجاریش دەچووینە بەردەم پەنجەرەکانی ئەوان قسەمان لەگەڵ دەکردن.

لەوکاتەی مەریوان باسی ڕاکردنی خۆی بۆم دەگێڕایـەوە لەوشوێنە بووین کـە ئـەوانی تیابەنـدکرابوو کـە پێیانـدەوت (مەنزومـە) ی کۆیـە کەسـەربە دەزگا تایبەتەکـەی عـەلی حەسـەن مەجیـدبوو، بـە دەسـتی هێمـای بـۆ هـەموو ئەوشـوێنانەدەکرد کەقـسەی لەسـەردەکرد، (مـەریوان) درێـژەی بـەم چـیرۆکە ڕاسـتەقینەیە داو وتـی: پورەکـەم کـە خوشـکی بـاوکم بـوو و دایکـی محەمـەد بووبەباوکمی وت : مـەریوان و محەمـەد دەردەکەم بابڕۆن، ئێمە تۆومانـدەبڕێ، وەك ئـەوەی دڵـی هەواڵیـدابێت کـە کۆمـەڵکوژیمان دەکەن،بـەلاّم بـاوکم ڕازی نەبوومن بڕۆم وتـی: با مـەریوان نـەڕوات چارەنووسـی لەگـەڵ خۆمانبێت، بەلاّم وابـزانم دواتـر بـاوکم لەقـسەکەی پەشـیمان بووبـووە لەبـەر ئـەوەی جزدانێکـی دابووە پورەکەم کە پێنج دیناریـەك و چارەکەدینارێکی تیـابوو وتبوی بیدە بـە (مەریوان) ، پورەکەم (٥) کچی عازەبی هەبوولەگەل (٣) کوڕ کە زۆر بچوکبوون تەنها (محەمەد) تەمەنی (١١) ساڵبوو،ئەم ژنە بەردەوام دەگریـا و دەیـوت تـەواو

تۆومانبرا،پورەکەم سوربوو لەسەر دەربازکردنی من و محەمەدی کوڕی، دوای هەشـت ڕۆژمانەوەمان،شـەوپورەکەم وتـی :بـەیانی زوو خەبەرتاندەکەمـەوە دەربازتـان دەکـەم،مانگی ڕەمـەزانبوو کـاتی بـانگی بـەیانی بـوو پورەکـەم وتی:مـەریوان هەسـتە تەنانـەت نەیهێشت دایکیشم پێبزانێـت، دەستی منی خـستەناودەستی محەمـەد و خۆیکەوتەپێـشمان بـەرەودەرگا بـچوکەکەی پشتەوە، دەرگاکە قوفڵێکی گەورەی لەسەربوو بەڵام دانەخرابوو ئیترنازانم بۆ دانەخرابوو،پورەکەم دەرگاکەی کردەوەو وتی: ڕاکەن ئاوڕی دواوەنەدەنەوە، نـازانم ئەوپاسـەوانانە چۆن ئێمـەیان نـەبینی لەهەرچوارگۆشـەی ئـەم شـوێنە چواردۆشـکە هەبوو،کەچوینەدەرەوە ڕامانکرد هـیچ ئاوەڕماننەدایـەوە سـیمێك لەبـەردەممان بوولەکـەلێنی سـیمەکەوە دەرچـووین مـن کراسەکەشـم گیربـوو لەسـیمەکە لەمـسەربۆئەوسەردڕا،تاکێك لەپێڵاوەکەشـم جێمـا دواتـر ئـەوەی تریـــشم فڕەدا،چـــوینەناوئەوگەرەکەی پـــشت گرتووخانەکـــە هـــیچ شـوێنێکمانەدەزانی شـارەزای کۆیـەش نـەبووین، هەنـدێ لەوناوەسـوڕاینەوە خـەریکبوو بگەڕێینـەوە بـۆ گرتووخانەکـە، دواتـر مـن هاتـەوەبیرم جارێـك هاتبوومـە کۆیـە لەگـەڵ خـاڵم (جـەواد) کـەزۆر منـداڵبووم شـوتیمان هێنـابوو بۆکۆیـە بۆفرۆشتن،محەمەد لـەمن منداڵتربوو، وتم:محەمـەد لای ئەوڕیزەدرەختـە جادەیـەك هەیـەدەڕوات بۆتـەق تەق،دەسـتی محەمـەدم گرتـوو ڕۆیـشتین بـەپێ تاگەیشتینە بازگەکـە کـەزۆر دوربـوو، گەیـشتینە بازگەکە سەربازەکە دەرمـانی کرد وتـی:بڕۆن لێرەمەوەستن،ئێمە زۆر بێوەزع بووین پێخـواس و جلـەکانمان پـیس و دڕاوبـوو، بـەڵام وازمـان نـەهێنا دیـسان چـویەنەوە، پیـاوێکی کوردلەبازگەکـەبوو نوینـەرەی سـەندیکای گواسـتنەوەبوو هەنـدی وەرەقـەی بەدەستەوەبوو لەئۆتۆمبێلـەکانی وەردەگرد،بانگی کـردین وتـی:ئێوەچیدەکەن لێرە ؟ئێمـەش بەسـەرهاتی خۆمـان وەکخـۆی بـۆی گێڕایـەوە، کـابراوتی: وسـبن قسەمەکەن ئەوسـەربازانە هـەواڵگرین بەسـبزانن ئێوەراتـانکردوە دەتانگرنـەوەو

دەتانبەنەوەشوێنی خۆتان لەگرتووخانەکە.راوەستن ئێستا دەتانێرمەوەبۆ تەق تەق، ئۆتۆمبێلێك هات غازی باركردبوو كابراكە بەشۆفێرەكەی وت: ئەم دوومنداڵەم بۆبگەیەنە تەق تەق،گەیشتینەوە تەق تەق چووینەماڵی پورێكم بەناوی (حەمدیە) كەخوشكی دایكمە، ئیتر هەواڵ بڵاوبووە كە دوو منداڵ لەئەنفال گەڕاونەتەوە، دەستەدەستە خەڵك دەهاتن بۆ هەواڵپرسی كەس و كاریان، لەترسی دەسگیركردنمان ئێمەیان گواستەوەبۆ ماڵی باپیرم ئیتر خۆمانشاردەوەو لەوێماینەوە باپیرم هەمووكەس وكاری لەدەستدابوو ئێمەش هەندێ بووینەمایەی فەرامۆشی، تاساڵی ١٩٩١ باپیرم بەوداخەوە ئەمری خوایكرد،خاڵەكانیشم ئەنكمیان بردەوە لای خۆیان لەبەر ئەوەی زۆر بێتاقەتبوو، ئیترمن بێكەس مامەوەوسەرگەردانبووم، هەر ڕۆژەی لەماڵێك شوێنێك دەمامەوە جێم نەبوو تیابسرەوم، ساڵی ١٩٩٣ سەرمهەڵگرت و ڕۆیشتم بۆئێران، چەندساڵێك لەوێمامەوە و كریكاریمكرد،هەندێ پارەم پەیداكرد و هاتمەوە هەولێرلەگەڵ (چیمەن) خان هاوسەرگیریمكرد و ئیستا لەكۆیە دادەنیشم و (٤) كوڕم هەیە،گەورەكیان ئێستا لەماڵنیە. ئێمە ئەوكات لە كۆیە لەماڵی مەریوان دانیشتبووین، بەردەوامبوو و وتی :بەناوەكانی ڕەزوان و كامەران كەبەناوی كامەرانی برامكردوە كەبەقەد سۆمای چاوم خۆشمدەویست،ئەمەش (یاد) ە هەرجارێك بانگی (یاد) دەكەم یادی ئازیزانم دەكەمەوە كەلەئەنفال بزركران.

مەریوان لەگەڵ خێزانێكی (١٠) كەسی ژیانی بەسەر دەبرد كە پێكهاتبوون لە دایك و باوك و خوشك وبراكانی، بەلام تاوانی ئەنفال هەموو خێزانەكەی لێی جیاكردەوە بەرەو چارەنووسێكی نادیار و بەتەنها خۆی مایەوە، ئەمەی خوارەوش ناوی سەرجەم ئەندامانی خێزانەكەیەتی :

١- عەبدولقادر ساڵح محەمەد لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٩ باوکی

٢- قەدریە ئیسماعیل میکائیل لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٣ دایکی

٣- کامەران عەبدلقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٤ برای

٤- نەریمان عەبدولقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٦ برای

٥- نەسرین عەبدواقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٧ خوشکی

٦- پەروین عەبدولقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٠ خوشکی

٧- نەرمین عەبدولقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٧٨ خوشکی

٨- بەیان عەبدولقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٤ خوشکی

٩- ژیان عەبدولقادر ساڵح لەدایکبووی ساڵی ١٩٨٧ خوشکی



## دەرواز فایق ئەحمەد / تاقانەی ئەنفال



دەرواز خــان بــە حــوکمی ئــەوەی منـداڵبوەو هەرلـە منداڵیـەوە دراوەتـە ماڵی پـورێکی لەبـەر ئـەوەی پورەکـەی منـداڵی نەبوە هەر ئەوەش هۆکاربوە کە بەرتاوانی ئـەنفال نەکــەوێت و لــە دایــك و بــاوکی راســتەقینەی خــۆ بــۆ هەتاهــەتایی دابڕیت،ئەگــەر ســەرنجی تاقانــەکانی ئــەنفال بــدەین بــەهۆکاری جیاجیــا لــە خێزانــەکانیان دابــڕوان، مــن هەوڵمــدا هەرچــۆنێك بێــت ئــەو قــسەم بۆبکــاتی هەرچــیەکی لــەبیر بێــت چــونکە ئــەم چــاوپێکەوتنانە دیکۆمێنتاریــەو ڕوداوە ڕاســتەقینەکان لــەخۆدەگرێت، دەستمکرد بەپرسیارکردن لێی و ئەمەی خوارەوەم لەقسەکانی هەڵێنجی .

دەرواز وتـی: مـن نـاوم (دەرواز فـایق ئەحمـەد) ە خـەڵکی گونـدی عەسـکر سـەربە ناحیـەی (ئاغجەلـەر) قـەزای (چەمـچەماڵ) مـن (ئـەنفال) م بەبیر نایـەت چونکە هەرلەمنداڵیـەوە باوکم منیداوە بە مـاڵی پـورێکم لـە گونـدی (قشلأغلو) چونکە ئەوپورەم منداڵی نـەبوە، هـەر لای ئەوان چومەتە قوتابخانـەو باخـچەی ساوایانی بێکەسان ناخۆشیم زۆر بینیوە، من کە لەقوتابخانەبوم هەستم دەکرد بێکەسم کە منداڵیتر لێیاندەدام کەسم نـەبوو لەسـەرم بێتـەوەلأم، مرۆڤ گـەر لـە خێزانەکـەی چـەند کەسێك بێت وەك ئـەوە نیـە بەتـەنها خـۆی تاقانـەبێت، بـەلأم ئێستا کەسـەیری منداڵـەکانم دەکـەم لەوساباشـترم هەستدەکەم کەسانێکم هـەن بـەدەورەوەمن وەك برایـەك،من تـەنها دایـك و بـاوکم لـە وێنـە بینیـوە خوشـك و براکانم لـەمن منداڵتر بوون هیچ وێنەیەکیان نـەماوە، ژیـانم ئێستاوئەوسا هـەر

ناخۆشه چونکه سەیردەکەی نە باوك نەدایك نە برایەك نە خوشکیك کەست نیە و هەمیشە هەست بەبێکەسی دەکەیت .

ئەمەی خوارەوەش ناوی خێزانەکەی دەروازە کە لە تاوانی ئەنفال بێسەروشوێنکران:

| | |
|---|---|
| ١. فایق ئەحمەد سەلیم | باوکی |
| ٢. ئامینە عەبدوڵا ئیسماعیل | دایکی |
| ٣. فەرمان فایق ئەحمەد | برای |
| ٤. دابان فایق ئەحمەد | برای |
| ٥. ئەرکان فایق ئەحمەد | برای |
| ٦. دەرون فایق ئەحمەد | خوشکی |

## سەباح نەجمەدین محەمەد عەلی / تاقانەی ئەنفال



لەقـەزای کـەلار لەگـەڵ کاکـە (سـەباح) ی تاقانـە دانیـشتین ودەسمکرد بـە پرسیارکردن و تۆزێـك گەراندمـەوە بـۆ رابـردوو و گێرانـەوەی ئـەو رەوشـە ناهـەموارەی لەسـەرەتای ژیانیـەوە لەتەمـەنێکی منـداڵی بـەرۆکی گرتوو وەکو مۆتەکە لە کۆڵی نابێتـەوە، چونکە ئیستاش لـە روخساری هـەموو نەهامەتیـەکان دەخوێنرێتـەوە، لەگـەڵ دابرانـی لەخێزانەکـەی، کەکاریگـەری زۆری بەسەریەوە هەیە، بەڵام لـە رووی کەسـایەتیەوە کەسـێکی بـەهێزو ورەبـەرزە .لـەوەڵامی ئـەو پرسـیارانەی ئاراستەمکردن وتی:

مـن نـاوم (سـەباح نەجمـەدین محەمـەد عـەلی) ە لـەدایکبووی سـاڵی ١٩٧٥خەڵکی گوندی (کونەکۆتر) کەسەربە ناحیەی (تیلەکۆ) قەزای (کەلار) ە، لەبیرم دێت ساڵی هەشتاکان لەگەڵ ئامۆزایەکم کە هەرلە تەمەنی من بوو وتم دەچـم بـۆ قوتابخانـە، بـەڵام بـاوکم وتـی: کـوڕم تـۆ هێـشتا منـداڵی بەکـەڵکی خوێندن نایەی، بەڵام من زۆر حەزم لەخوێندن بوو چونکە دەمبینی مامەکانم و ئامۆزاکانم کـە لـەمن گـەورە تـر بـوون دەچـوونە قوتابخانـە، دەفتـەر و قەڵـەمیان پێبوو، دڵم لەو شتانە چووبوو، ئەوە نـەبوو کـەبزانم خوێندن باشـە و پێویـستە چونکە ئەوانـەم نـازانی، ئیتر ئـەوکات ئەوەنـدە سوربووم بۆ چوونە قوتابخانـە باوکم ناردمی، چەندجارێك چوینە قوتابخانەکە، بەڵام مامۆستاکە لەوێ نـەبوو، قوتابخانەکـە لەگونـدێکی تریـوو بـەناوی (هـەوارە قوڵـە) ، خـەڵکی گونـدەکانی

دەوروبەری لەوێدەیانخوێند، منیش لەوێ درێژەم بەخوێندندا، ژیانی ئێمە لە گونـدی (کونـەکۆتر) ژیـانێکی زۆر سـادە و ئاسـایی بـوو، کـە خـەریکی بـە خێوکردنی مەڕو مـاڵات و پەلـەوەر و کشتوکاڵ بـووین. ساڵی ١٩٨٧ لەبیرمە حکومەتی بەعس ناوچەی قەدەغەکراوی دروستکرد لەنێوان جادەگشتیەکان و گوندە دوورەدەستەکان، کۆمەڵێ گوندی رووخاند و تەختی کرد، دانیشتوانی گونـدە ڕوخاوەکـان هاتنـە گونـدەکانی لای ئێمـە، بـەلام پرۆسـەی ڕوخانەکـە نەگەیـشتە گونـدەکانی ئێمـە، ئـیتر نـازانم هێـشتا بڕیـاری نـەدابوو لەسـەر گونـدەکانی ئێمـە نـازانم چـۆن بـوو؟ راسـتە ئێمـە خـەریکی کـشتوکاڵبووین باوکیشم پێشمەرگەبوو، دایکم دەوری باوك و دایکی بۆ ئێمە دەبینی لەبیرمە منی لەگەڵ خۆی دەبرد بە داس درەوی دەکرد، دەچوو بۆ ئاش بۆهاڕینی گەنم کەسـی گـەورەمان نـەبوو، خیزانێکـی گـەورەش بـووین هـەموومان منـداڵبووین بەمنـەوە (٨) منـداڵبووین، لـەکاتی ئەنفالەکـە لـە ناوچـەی قـەرەداغ و گونـدی هـەزارکانی شـێخ حوسـێن دەسـتی پێکردبوو، شـێخ حوسـێنی هـەزارکانی زۆر هـاورێی بـاوکم بـوو، زۆر یـەکیان خۆشدەویست،شیخ حوسـێن هاتـە لای بـاوکم تەگبیربکەن چیبکەن چی نەکەن ؟ نامـەیان نوسـی بۆ مـەلا حەسـەن ڕوغزایـی و هەندی پیاوی ناوچـەکە بـۆ ئـەوەی بڕیاربـدەن لەسەر چارەنوسـی خەڵکەکـە، لەبیرمە لەکاتی نوسینەکە قەڵەمەکەی شێخ حوسێن مەرەکەبی تیانـەما منیش قەڵـەمێکم پێبـوو ووتـی:ئەوقەڵەمـەم دەدەیـتێ بـاوکم ووتـی: بیـدەرێ ئەوەنـدە پیاوێکی بەڕێز بوو هەرچەندە من منداڵبووم تەمەنم (١٣) ساڵبوو پێیـی ووتم : گـەردنم ئازاکـە. سـوپای ئێـراق تـەنگی بـە خەڵکەکـە هەڵـچنی وگونـدەکانی سـوتاند، بـەلام گوندەکـەی ئێمـە سـوپا نەهاتـەناوی هەربـە فڕۆکـە سـوتاندی، خەڵکێکی زۆر هاتبوونە گوندەکەی ئێمە لەکانی عوبید و زەنگەنە و ناوچەی ڕوغزایی عەشیرەتی خۆمان و تەرخانی و گوندەکانی (تەپەسەوز و سێخران و ماڵ شێخ) هەتا لە ناوچەی قەرەداغەوە خـەڵك هاتبوون، بەلام خەڵکەکە لە ناو گوندەکـە دەرچـووبوون کـاتی بۆردومـانی فڕۆکـەکان، ئـیتر لـە هەموولایەکـەوە سـوپا ئابڵوقـەی ناوچـەکەیدا، پێـشمەرگە هەنـدێ بـەرگریکرد، بـەلام لـەتوانای

ئەوان نەبوو، بۆیە بە خەڵکەکەیان ووت بڕۆن، خەڵکی ناوچەکەی ئێمە زۆربەی بەرەو گوندی (قەڵاقۆچاڵی) ڕۆیشتن لەوێ و لە ملەسورە ئەنفالکران .من ئەو بەیانیەی لە گوندەکە دەرچوین لەخێزانەکەم دابڕام بە حوکمی ئەوەی بڕکەیەك مەڕمان هەبوو مامم وتی بیهێنە تێکەڵی بکە لەگەڵ ڕانەکەی ئێمە،باش لەبیرم نیە باوکم ئەوکات لەماڵ بوو یاننا، ئێمە زووتر دەرچووین هێشتا خەڵك لەناوگوندەکە مابوو، ماڵەوەش لەگەڵ ماڵی مامم بە تراکتۆر دەرچووبوون، ئێمە هاتینە گوندی (پەلەوش) دواتر هاتینە گوندی (کوڵەجۆی حاجی حەمەجان) شەولەوێ ماینەوە، بەلاّم لەوێش کەس نەمابوو,قوتابخانەیەکی لێبوو بەکۆنکرێت دروستکرابوو تەقاندیانەوە و ڕوخاندیان، ئێمەش بەمەڕەکانەوە لەوێ ماینەوە مامێکم هەبوو (ساڵح) ی ناوبوو سەریلێماندەدا مامەکانی ترم و خاڵم سەریان لێماندەدا دەیانووت ئەوەتا ماڵەکانمان لە (قەڵاقۆچاڵیە) ئێمەش چارەنووسمان وەك ئەوخەڵکەیە، دواتر زانیم باوکم هەواڵی ناردبوو وتبووی :ئەوکوڕەم بۆبێننەوە من ماڵ و مەڕوهیچم ناوێ مەبەستی (من) بوو، میمکم ماوە ئێستا لەگەڵ من دەژی واتە خوشکی باوکم وتی: هەندێ خزم و ناسیاومان کە جاش بوون هەواڵیان ناردبوو بۆ باوکم وتبیان دێین دەرتان دەکەین، تەنانەت ئەوکوڕەی میمکزام کە خۆی جاش بوو ئێمەیان دەرکرد، ئەوهەموو ئامرسریە و مستەشارانە چووبوونە لای باوکم وتبیان دەرتان دەکەین باوکم پێیانی وتبوو بڕۆن ئێوە جاشن چڵکاو خۆری بەعسن هەر لەو شوێنە وایپێوتبوون، باوکم سەرەتا وەعدی بە شێخ حوسێن دابوو کەبچن بۆ ئێران لە ژێر کاریگەری ئەنکم چونکە باوکمی زۆر خۆشویستووە،خاڵێك و مامێکم ڕزگاریان بووبوو هەرچەندە خاڵەکەم دواتر ئەنفالکرایەوە، باوکم پێیانی وتبوو مادام ئێوە دەڕۆن دەبنە بندەستەی خەڵك بڕۆن هیچی من نین، وتبووی ناڕۆین بۆ ژێر دەستەیی کەس بەعس چیمان لێدەکات بابیکات،ئیتر ئیمە چەند شەوێك لە نێوان گوندی قەلاقۆچاڵی و ملەسورە ماینەوە ئەو میمکزایەم هات بۆلامان وتی: وەرن بادەرتانبکەم خۆتان و مەرەکانتان ئەو شارەزابوو ڕۆژێك نزیك خۆر ئاوابوون بوو وتی: وەرن

بابڕۆین، لەوکاتـەیا مانگایـەکی کـوڕێکی ئامۆزای بـاوکم زایـی گـۆلکێکی بـوو سـەرمانبڕی زۆر گونـاح بـوو چـونکە نەمانـدەتوانی لەگـەڵ خۆمـان بیبـەین، تەنانەت حەیوانە بچووکەکانمان هـەر جێدەهێشت. وەلاّ مانگاکە شێت و هار بـوو دەیقۆرانـد، کەوتینـە ڕێ لـە نێـوان وەلیهێـل و سـەرقەلأوە دەرمانیـانکرد، ئەوسا مـن منداڵبووم نەمدەزانی کویّ کوێیـە؟ ئیستا دەزانم ئەو شـوێنە بـوو، هاتینـە نێوان ناحیـەی سەرقەلأو دێبنـەو جەبەلەکە بۆمن چوونە ئـەو شـوێنە شتێکی زەحمەتبوو، چونکە منداڵبووم وەك ئەوە وابوو ئێستا بچم بۆ ئەورووپا، پیاوێکی بەڕێز کە خەڵکی سەرقەلأ بوو، ناوی (حـاجی عـەلی جەمـە) بووهـەزار ڕەحمەت لەگۆڕی هاتە لامان نانی بۆ هاوردین نانێکی ئاردی سپی بوو، ئێمـە لەوماوەیـە نانەکـەمان کـەڕو لێیـدابوو، نـاخورا دوونـانم لەونانەسـپیە خـوارد ئێستاش تـامی لـەدەمم مـاوە (یـاخوا) بـەخاتری ئەونانـە ئـەوپیاوە دەبـچێتە بەهەشـت، ئـەوپیاوە مریـشکی بۆمانـدەهێنا دەیبرژانـد بـەزمانی بـەرۆژووەوە هـەردەگریاش بۆمـان ئەونـدە بـەرێزبوو، ئـەوکوڕەی میمکـزامیش زۆر پێمانـەوە مانـــدوبوو،ئیتر بڕبـــڕ مـــەڕەکانی دەبـــرد دەیفرۆشـــت و پارەکـــەی بۆمـــان دەهـاوردەوە، چـونکە مـەڕەکان زۆر بـوو، نەیـدەتوانی هـەمووی بەرێتـە مـاڵی خۆیـان، مـەڕەکان تـەواو بـوو ئێمـەی بردەمـاڵی خۆیـان، مـن و مـام و مـیمکم تەنانەت هەر ئەو میمکزایەی باوکم منداڵەکانی خاڵم و مامێکی تـرم و میمکێکم و بڕێ کچی ئامۆزازام هـەر ئـەو دەربازی کردبوون، ئیترلـەماڵی ئـەوان ماینـەوە بـەمنی وت تـۆ بـەڕۆژەوە مانگاکـان ببـەدەرەوە، تـۆ منـداڵی کـەس نانتناسـیّ، لەگـەڵ کـوڕێکی خـۆی دەچـوین، بـەبیرم دێـت لـەماڵیان دانیـشتبووین بـەبڵنگۆ بانگەوازیـدەکرد هەرکەسـیّ گوندنـشینێك لـەماڵی بگـرین دەستبەسـەر ماڵیـدا دەگـــرین و دەســـگیریاندەکەین شـــوێنبزریاندەکەین،ئێمە وتمـــان بـــابڕۆین میمکزاکەی بـاوکم وتـی: بـەخواناڕۆن دەبـیّ منـیش لەگـەڵ ئێـوە بگیرێم، دوای چـەند ڕۆژێـك ئەوخاڵـەم کەمنداڵـەکانی رزگـاربوو بـوو وتـی: مـن چیبکەم هـیچ شـتیکم پێنیـە خێزانەکـەی (٨) کـەس بـوون ئەوکاتـەش خـەڵك بـە دزیـەوە دەچوونە گوندەکان شتومەکی ماڵیان دەهێنا خاڵیشم مـامی لەگـەڵ خـۆی بـرد

و چون لە گوندەکەمان شت بێنن کە ڕۆیشتن چوبوونە لای گوندەکان دیسان هێزێکــی ســوپای بــەعس دەرچــووبوو هــەردووکیانی گرتبوو،ئــەوانیش ئەنفالکران بەنیازبوون منیش لەگەڵ خۆیان بەرن، بەڵام من قاچم ژانیدەکرد بۆیە منیان نەبرد، وانەبوایە منیش دەگیرام،من کە لەو ماڵە بووم خیزانی ئەو پیاوە وەك دایکم خزمەتی دەکردم جلی دەشۆریم سەری چاکدەکردم، دڵی دەدامەوە کۆمەڵێ خەڵك بووین لەماڵیان خوا هەڵناگریێ زۆر خزمەتیانکردین، بەڵام من عەشیرەتێکی گەورەم هەیە بە ناوی (ڕوغزایی) جگە لەمامێکی دایکم نەبێ منی بردووە بۆ ماڵی خۆی کەس منی نەبردەماڵی خۆی، کاتێ دەچوومە ماڵێك شەو لەێ دەبووم لە دڵی خۆمدا دەمووت یاخوا بڵێن نیوەڕۆش لێرەبە، یان ئەگەر نیوەڕۆ لەماڵێك بوومایە دەمووت یاخوا بڵێن ئێوارەش لێرەبە، ئێمەی تاقانە بەوحاڵە گەورەبووین، بۆیەش لەماڵی میمکزاکەم دەرچووم هەستم دەکرد ئەرکم لەسەریان، ماوەیەك لەماڵان بووم دواتر چووم لە چێشتخانەیەك کارمکرد هەرچەندە هیچم نازانی، بەڵام فێری قاپشۆرین بووم مانگی (٤٠) دیناریان دەدامێ،بەرۆژ کارمدەکرد بەشەویش لەگازینۆکەی دەخەوتم، خوادەزانێ شەوی واهەبووە تابەیانی گریاوم بۆ غەریبی و بێکەسی خۆم دەگریام زۆر پێویستم بەدایك وباوکم بوو، هەموو ژیانم گریان بوو بێئەوەی کەس پێیمبزانێ، من زۆر بەدڵسۆزی ئیشم دەکرد هیچ شوێنێکیشم نەبووبۆی بچم ئەوەندە بەدڵسۆزی کارمدەکرد تا موچەکەمیان کردە (١٦٠) دینار بۆمن زۆربوو، جاری وا هەبوو عەرەبەکان دەهاتن داوای ئاو یان شتێکیان دەکرد بۆیانم دەبرد دەیانووت (تعیش) واتە بژی من تێناگەیشتم وامدەزانی خواردنە دەموت (تعیش ماکو) واتە (بژی نیە) ،دوایی دەهاتن پێدەکەنین دەیانوت کاکەسەباح (تعیش ماکو) دواتر زانیم واتە بژی، بەو شێوەیە ژیام تاکو نەنکم هاتەوە، دوای (٦) مانگ نەنکم لە نوگرەسەلمان ڕزگاری بوو هاتەوە باوکم پێی وتبوو دایە توخوا ئەگەر تۆ ڕزگارت بوو چوویتەوە (سەباح) ئامانەتی تۆ بێ، نەنکم ئەوەشی گێراوە لەو کاتەی کەگیرابوون پێیانیان وتبوو حەمەی مامە حوسێن و نەجمەدین ئەو

مێژەرانەلەسەرتان بکەنەوە (بەعس) زاڵمە باثازارتان نەدەن، لە وەلآمدا وتبوویان وەلاّ داینـاگرین، مەگەر بەزلەی بەعس لەسەرمان بیکەنەوە، دوو گەنجی زۆرجوانبوون،ئیترنەنکم خانویەکی کرێ من و میمکم واتە خوشکی باوکم بردمانیەلای خۆی، میمکەکەی تریشم کە خێزانی خاڵم بوو ئەویشی لەگەڵ منداڵەکانی هاوردە لامان، خانویەکی تریشی کرێی بەتەمابوو منداڵەکانی تری ئازادبکرێن هەرچاوەڕوانیبووین تاڕاپەرینی ١٩٩١ هەرنەهاتنەوە، هیوایەکمان هەبوو تاساڵی٢٠٠٣و ڕووخانی سەدام ئیتر نائومیدبووین. لە ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ یش ڕامانکرد هەتا ناوچەی شلێر سنوری ئێران رۆیشتین، دواتر گەڕاینەوە هەڵەبجەی شەهید هەتا ساڵی ١٩٩٣ لە هەڵەبجە بووین، دواتر گەڕاینەوە ئۆردوگای ڕزگاری، لە ١٩٩٤/٤/١٤ خیزانم پێکهاورد لەگەڵ کچێکی ئامۆزازای باوکم، ئیستا لە خوا بەزیادبێ (٤) کوڕو (٣) کچم هەیە، لە ١٩٩٥/٣/٢٠ چووینەوە لادێکەی خۆمان (کونەکۆتر) ئاوەدانمان کردەوە لە ٢٠٠٥/٦/٥ گەراینەوەئۆردوگای رزگاری، من تاکو ئێستاش کاریگەری نەبوونی کەس و کارم هەرلەسەرمەو لەبیرم ناچێتەوە، کاتێ جەژن یان خۆشیەك یان بۆنەیەك دەبێ سەیرەکەم کەسە دڵسۆزەکانم کەس نیە بەدەورمەوە .یان کەسێ رۆژێ لە رۆژان قسەیەکی ناخۆشی پێمان وتیبی یان خۆی بەسەرمان هەڵکێشابێ یان بەئۆتۆمبێل شکاندبێتیە سەرمان، کەسمان لەپشتنیە بەرگریمان لێبکات، نا خۆشیەکانی ئێمە زۆر زۆرن ناگێڕدرینەوە و لەباسکردن نایەن، زۆرجار منداڵەکانم لێم دەپرسن بابە بۆ مامم وپورمان نیە بۆ خاڵمان نیە بچین بۆماڵیان، چیبکەم بەدڵخۆشیەوە وەلاّمیان دەدەمەوە دەڵێم: کەسوکاری ئێمە شەهیدن جێی سەربەرزین، من کیشەی دەرنیم زۆرە بۆ منداڵەکانمی باس ناکەم، جاری واهەیە دەڵێن بڕۆین بۆ پارکێ بۆ شوێنێ دڵم ناپشکوێ بڕۆم، بۆ ئەوەی نەچم دەڵێم ڕێگا ناخۆشە یان هەربەربەستێکی تر دروستدەکەم بۆ ئەوەی نەچم ڕەنگە هەندێ جاریش بڵێم توانام نیەخۆ ڕەنگە بزانن هەندێ لەقسەکانی من وانیە، بەلاّم هەوڵدەدەم تاقەناعەتیان پێدەکەم، من (٧) منداڵم هەیە لە خوابەزیادبێ تیایانە لە زانکۆی

ئەهلیە ساڵانە زیاتر لە دوو ملیۆن سەرفیە ئەوە هەمووی پارەی گەرەکە، من مەبەستم پارە نیە خۆزگا مەتریٚ زەوی و یەك فلسیان پێمانەدایە تەنها مێژووەکەمان بنوسرایەوە، مێژوو لە هەمووشتێك گرنگترە، واتە مێژووی ئەنفال بۆ ژێرپێخراوە ؟ خۆئێمە زۆر نین ئێمە هەموومان لەم ولاٚتە شەش ملیۆنین با حەوت بین کە ئەڵێن ئەنفال (١٨٢٠٠٠) هەزارکەسە راستە، رەنگە (١٨٢٠٠٠) هەزارکەس راگوازرابێت، بەلاٚم قەناعەتم نیە هەموویان زیندەبەچاڵکرابن، ئێمە بۆ نەزانین چەندکەسمان زیندەبەچاڵکراوە، من لەچەندین کەسی یاسیایم بیستووە کە دەڵێن یەك کەسیش بکوژرێت (جینۆساید) ە مادام مەبەستی قڕکردن هەبێت، کەخۆت لەمن شارەزاتری سەدان کۆنفرانس و کۆبوونەوە کراوە وادەڵێن، خۆ قوربانیەکانی ئێمە لە (٥٠,٠٠٠) هەزارکەس زیاترە ئیتر بۆ بترسین بڵێین ئەوەندەمان ئەنفالە؟ .

ئەمەی خوارەوەش ناوی قوربانیەکانی خێزانەکەی (سەباح) ە کە لە تاوانی ئەنفال شوێنبزرکران و تائێستاش نەیانی بینیەوە:

١ . نەجمەدین محەمەدعەلی عەبدولکەریم / باوکم لەدایکبووی ١٩٥٥
٢ . یاسەمەن محەمەدئەمین سلێمان / دایکم لەدایکبووی ١٩٥٦
٣ . گەلاویژ نەجمەدین محەمەد عەلی / خوشکم لەدایکبووی ١٩٧٧
٤ . گەردە نەجمەدین محەمەدعەلی / خوشکم لەدایکبووی ١٩٨٩
٥ . ئاوات نەجمەدین محەمەدعەلی /خوشکم لەدایکبووی ١٩٨
٦ . شلێر نەجمەدین محەمەدعەلی / خۆشکم لەدایکبووی ١٩٨٣
٧ . شەونم نەجمەدین محەمەدعەلی / خوشکم لەدایکبووی ١٩٨٥
٨ . سیروان نەجمەدین محەمەدعەلی / برام لەدایکبووی ١٩٨٧
٩ . سەلاح نەجمەدین محەمەدعەلی / برام لەدایکبووی (١٩٨٨) تەمەنی تەنها (٢) مانگ بوو.

سەباح جگە لە خێزانەکەی (٤) مام و (٢) خاڵی ئەنفالکراون کە هەندێکیان بەماڵ و منداڵەوە تیاچوون هەر وارسیشیان نەماوە، دەیان خزمی تریشی لەتاوانی ئەنفال تیاچوون .

## لەیلا ئازاد عەبدولڵا / تاقانەی ئەنفال



لەیلا خان هەرچەندە ئەوکات لە تەمەنی منداڵیدا دەبێت، بەڵام هەموو ڕوداوەکەی لەبیرە،کاتێك من چاوپێکەوتنم لەگەڵ کردوو سەرنجی گێڕانەوەی چیرۆکی تراژیدیای خۆیانی دەگێڕایەوە ڕێك وەکو فلیمێکی سینەمایی ئەم تاوانە دەهاتە بەردیدەم، چونکە زۆر بەسەلیقەوە قسەی دەکرد و هەموو ڕوداوەکەی وەك خۆی دەگێڕایەوە. من بەردەوام بووم لە پرسیارکردن ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی دامەوە.

لەیلا وتی: من خەڵکی گوندی (سەرچنار) ناحیەی . ئاغجەلەر . قەزای چەمچەماڵ) م لەبناری چیای خاڵخاڵان ناوچەی شێخ بزێنی سەرو،ئێمە وەکو خەڵکی گوندەکەمان خەریکی کاسبی و جوتیاری خۆمان بووین، کاتێك گۆپتەپە کیمیابارانکرا لەترسان گوندەکەی خۆمان چۆڵکردو چووینە گوندی گردخەبەر هەر ئەوشەوە گەراینەوە گوندی سەرچنار دیسان جارێکی تر گەراینەوە گردخەبەر، ئێمە دەمانویست بەرەو ناحیەی تەق تەق بڕۆین، بەڵام ڕێگا نەبوو چونکە وتیان سوپاو جاش ڕێگاکانیان گرتوە، دواتر هیچ چارمان نەما ڕۆیشتین بەرەو گوندی (قە میشە) ، لای گوندی قەسرۆك و قەمیشە کەوتینە دەست سوپاو جاشەکان،ئێمە هەموومان ترکتۆرمان پێبوو، خەڵکی

تریشی زۆر لێبوو هەموومانیان کۆکردەوە، هەموو خەڵکەکەیان دەپشکنی پیاو و ژن و منداڵ هەرچ پارە و زیڕو شتی بەهادار هەبوایە دەیانبرد، من داخیلەیەکی خۆم پێبوو دایکم وتی بالای خۆتبیٚ نەوەك لەیەك دابڕێن، لەناو دەستم بوو سەربازێك لێی ساندم، زۆر ترسام دەنگم نەکرد وادەزانم ئێستایە هەرگیز لەبیرم ناچێت، دایکم و ئەوانی تر هەرچییەکیان پێبوو لێیانیان ساند،دوای ئەوە ئێمەیان سواری تراکتۆرەکانی خۆمانکرد، بەرەو شارۆچکەی تەق تەق کەشوێنێکی سەربازی بوو لە تەك پردی تەق تەق لەویٚ خەڵك کەوتنە جوڵە و هەڵپەی خۆپزگار کردن، هەندیٚ لەسەربازەکان دەیانووت بڕۆن ئاوبخۆن لە زێیەکە دیاربوو مەبەستیان ئەوە بوو ئێمە دەربازبین،بەلاّم ئێمە تێنەدەگەیشتین ئەوانیش بەئاشکرا نەیاندەوێرا پیمان بلێن رابکەن، ئەوەی تێدەگەیشت دەڕۆیشت بەتایبەت ئەوانەی کەس و کاریان لەنا شارۆچکەی تەق تەق بوو، خەڵکی واهەبوو باوەڕیان ناکرد ئەم هەموو خەڵکە بکوژن، ئیمە لەو شوینە تەنها ژن و منداڵ و پیاوە بەتەمەنەکان مابووین چونکە هەر لای گوندەکانی قەسرۆك و قەمیشە پیاوەکانیان لەئێمە جیاکردەوە، ئێمە هەردوو باپیرم واتە باوکی باوکم و باوکی دایکم لەگەڵمانبوون،ئێمەیان جیاکردەوە لەژورێکی ئەو شوێنە،من و خوشکێکی باوکم و سیٚ خوشکی دایکم و خالۆژنم و دوو ئامۆزای باوکم بەسەربازەکان وترابوو ئەمانە دەربازبکەن دیاربوو باپیرەکانم رێککەوتبوون لەگەڵ سەربازەکان ئیتر نازانم بەپارەبوو چۆن بوو؟ چونکە ئەوکات من فامی ئەوشتانەم ناکرد منداڵبووم، بەلاّم دەمبینی باپیرم و پیاوە بەسالاّچوەکانی تر قسەیان لەگەڵ سەربازەکان دەکرد، ڕەنگە ئەوانیش پارەیان لابووبیٚ و شاردبێتیانەوە، لەبیرم نیە ئەو سەربازانە کوردبووبن یان عەرەب، بەلاّم بە دڵنیاییەوە دەزانم ئەو دوو سەربازەی ئێمەیاندایە دەست دوو سەربازەکەیتر عەرەب بوون، دوای ئەوە دایکم و ئەوانی تریان کردە ژورێکی ترەوە، ئەوانەی لەگەڵمبوون (شلێرحەوێز خالۆژنم بوو، نایلە تاهیر فارس خوشکی دایکم بوو،فەوزیە تاهیر فارس خوشکی دایکم بوو،وەعدیە تاهیر

فارس خوشكى دايكم بوو،چەندكەسێكى تريش بوون، (زيلى) سەربازى (زيل ئۆتۆمبێلێكى سەربازيە) لەبەردەم دەرگاكە وەستابوون بۆ ئەوەى خەڵكەكەى پێبگوازنەوە، دوو سەربازەكە بەئێمەيانوت ئێوە بڕۆنە دەرەوە بۆلاى زيلەكان كە گوايە سەردەكەون بۆ ناو زيلەكان شتەكانى دەستان فڕێبدەنە ناو زيلەكەوە و بەتەنيشتيا بڕۆن هيچ خۆتان تێكمەدەن، ئێمەش هەريەكەو هەندێ جل و پێداويستيمان پێبوو فڕەماندايە ناو زيلەكەو ڕۆيشتين، ئەو شوێنە درەختى قەيسى زۆرى لێبوو، ئەو دووكەسە هەر چەند مەترێك لەگەڵمان هاتن و دامانيانەدەست چەند كەسێكى تر كە ئەوانيش سەربازى عەرەب بوون،دوانەكەى تر گەڕانەوە بۆلاى دايكم و ئەوان، ئيتر نەمانزانى چيان بەسەرهات، ئيتر لەو شوينەوە لەدايكم و خێزانەكەم دابڕام، ئەو سەربازانە ئێمەيان بردە ژورێك كەمێك دوربوو لەو شوێنەى لێوەى دەربازبووين هەندى بەتانى و پێخەف لێبوو وتيان خۆتان داپۆشن، ئەگەر كەسانێك هات باوابزانن ئێوەش سەربازن نوستوون،هەر كەسێكيش هاتە ئێرە وەڵامى كەس مەدەنەوەو سەر هەڵمەبڕن، باش بوو كەس نەهات، دواتر ئێمەيان دەركرد، ئامۆزايەكم ئێستاماوە لەو دەشتە لەدايكبوو دواتر تركتۆرەكەمان قڵپبوەوە دايكى لە سێ جێ قۆلى شكابوو نەيدەتوانى مەلۆتكەكە هەڵبگرێت سەربازەكە لێى وەرگرت هەر سەيرى ئاسمانى دەكرد دوعاى دەكردو لە خوا دەپاڕايەوە بەزمانى عەرەبى و دەشگريا ديار بوو زۆر لەو زروفەى ئێمە بێتاقەتبوو،من زۆر سەرنجى ئەو پياوەم دەدا زۆر چاك لەبيرمە، منيش دەمووت ئەمە بۆ وادەكات ئێمە چيمانە بۆ دەگرى؟ تومەز ئەو دەيزانى چى لەم خەڵكەدەكەن بزرماندەكەن ئێمە نەماندەزانى،ئيمەيان بردە ناو درەختە قەيسيەكان وتيان بڕۆن يەكى هەندێك گياوشت بخەنە ژێردەستان كە گوايە خەڵكى شارۆچكەى تەق تەقن، بڕۆ بۆماڵە ناسياو و خزمى خۆتان لەناو شارۆچكەكە، هەمووومان چوينە ماڵى خاڵم (ئاغالە) لەبيرمە ئەو شەوە تابەيانى گريام و دەموت دايكم دەوێت،هەتا بەيانى چاوەڕێى دايكمكرد، بەڵام نەهات،دواى ئەوە ماڵێكى

ناسیاومان هەبوو لەکەرکوك تورکمان بوون پێشتر سێ کوڕیان ڕاکردووی سەربازی سوپای ئێراق بوون لای ماڵی باپیرم واتە باوکی دایکم بوون بەخێویاندەکردن،من و خوشکێکی باوکم چوینەماڵیان لەکەرکوك سێ مانگێ لەوێ ماینەوە، ئەگەر پشکنین و گەڕانی پیاوەکانی ڕژێم هەبوایە ئێمەیان لەژێر زەوی دەشاردەوە، خۆیان ئەو شوێنەیان دروستکردبوو،دوای ئەوە هاتینەوە بۆ تەق تەق خانویەکی ئەحمەد ئاغا هەبوو وتی تێدابژین بۆ خۆتان کرێم لێتان ناوێت، ئێمە دیسان لەگەڵ ئەوانیتر یەکمانگرتەوە هەموومان گەنج بووین ژنەکانیش هەر گەنج بوون لەوێماینەوە، دواتر کەپیر و پەککەوتەکانیان ئازادکرد باپیرم و نەنکم هاتنەوە لەگەڵ ئەوان ژیام هەتا شومکرد، بەلاّم باوەڕناکەم هیچ کەسێك بتوانێ جێگای دایك و باوکم بگرێتەوە.

ئەمەی خوارەوەش ناوی خێزانەکەی خاتوو لەیلان کە لەتاوانی ئەنفال بێسەروشوێنکران:

١. ئازاد عەبدولاّ حارس ١٩٥٧ باوکی
٢. فەخریە تاهیر فارس ١٩٥٣ دایکی
٢. پشتیوان ئازاد عەبدولاّ ١٩٨١ برای
٤ . ڕێباز ئازاد عەبدولاّ ١٩٨٢ برای
٥. سەرباز ئازاد عەبدولاّ ١٩٨٤ برای

## ئەحمەد محەممەد کریم / تاقانەی ئەنفال



ئەحمـــەد کەســـێکی قـــاڵبووی پێـــــشمەرگایەتیەو کەســـــێکی چـــاوکراوەیە، لەســـــەر دەمــــی جێبـــەجێکردنی تـــاوانی ئـــەنفال پێـشمەرگەبوە، بــە حــوکمی ئــەوەی گــەورەبوە ڕوداوەکـــان زۆر بــەجوانی دەگێڕێتـــەوە مـــن دەســـتمکرد بـــە پرسیارکردن و ئەویش بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی دامەوە،

ئەحەمەد وتی: من خەڵکی گوندی (تەرەقــە) ناحیــەی (شــوان) پارێزگــای (کەرکوک) م، تاوانی ئەنفال تاوانێکە وشە ناتوانێ تەعبیری لێبکات، من لە خێزانەکەی خۆمەوە لێی دەڕوانم، شتێکە کەناتوانین لەبیری بکەین ناتوانین باسی بکەین، ئێمەی کورد ئەوەندە سەرکوتکراوین ناتوانین باسی ئازارەکانی خۆشمان بکەین، من لەخێزانەکی خۆماناکەسم ڕزگارنەبوو بەتەنها خۆم ماوم، ئەوکات گەنجێکی هەرزەکاربووم پێشمەگە بووم، بۆیە دەربازبووم لە تاوانی ئەنفال، خێزانەکەی من خەریکی جوتیاری و کاسبی خۆیان بوون لەگوندی (تەرەقە) لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/٥ بوو کۆمەڵێ خەڵك لە دیوی (قەڵاسێوکە) وە هاتن بە دیوی لای شوانا وتیان گوندی (گۆپتەپە) کیمیابارانکراوە و خەڵکی زۆر بەرکـەوتوون، ئێمــەش ئــەوکات چــەند ڕۆژێــك بووگوندەکــەی خۆمــان چـۆڵکردبوو (تەرەقـە) کەسـی تیانەمابوو،خەڵکەکـە لـە هـەردەی ماسـقەلان و شیوەسور خۆیان شاردبوەوە،ئیتر کە ئەو خەڵکەش لەدیوی (قەلاسیوکە) وە

هـاتن وتيـان ئەگـەر بەكۆمـەڵ خـەڵك ببيـنن بـەكيمياوى لێيـدەدەن، خەڵكەكـە بەگشتى بڕياريانـدا وتيـان دەبـێ چارەسـەرى خۆمـان بكـەين و ئـەم ناوچـەيە جێبێلين،ڕەنگە بڵێم بەهەزاران خەڵك لەودەشتە بەرەو جادەى (شوان . كەركوك) بەڕێكـــەوتن بەمەبەســـتى ئـــەوەى خۆيـــان ڕزگاربكـــەن بـــەرەو كـــەركوك و ئۆردوگاكانى دەورو بەرى هەولێر،ماڵى ئێمەش خۆم بەڕێيانمكرد تاكو گوندى (مۆرد) لەگەڵيان چووم ئيتر من گەڕامـەوە چونكە نزيك جادەكەوتينـەوە، ئـەوان چووبوونە سەر جادە فەوجێكى جاش لەوێبوون هەندێ خەڵكيان ڕزگاركردبوو بەتايبـەت ئـەوەى خـزم و دۆسـتى خۆيـان بوون،بـەڵام دوو هۆكـار هـەبوون بـۆ ئەوەى يارمەتى خێزانەكەى من نەدرێت يەكەم باوكم كوڕى پێشمەرگەبوو واتـە من پێشمەرگەبووم، ئەو فەرمانـدەى فەوجـەش يارمـەتى خێزانـى پێشمەرگەى نـادا، فەوجەكـە هەمووشـيان خـەڵكى (شـوان) بـوون يـەكيان دەناســى، ئەومـستەشارە نـاوى (ئەحمـد ڕەجـەب ) بـوو مـن تاوانبـارى ناكـەم ڕەنگـە ترسـابێت يارمـەتى كەسـوكارى پێشمەرگەبدات ڕەنگـە هـەرخۆى بـاوەڕى وابووبێ، من ناتوانم دەستنيشانى بكەم ئەوە لاى خۆيـەتى، بەكردار يارمـەتى خـەڵكى زۆريـدابوو، بەڵام يارمـەتى كەسوكارى پێشمەرگەى نـەدا، خێزانەكـەى ئێمـەش زۆر بـوون ژمارەيـان (١٠) كـەس بـوو دايكـم و بـاوكم و دوو خوشـكم و شەش بـرام بوون،دەربازكردنى (١٠) كەسـيش ئاسـان نـەبوو ڕەنگـە لەوجادەيە قەمەرەيەك هاتبێت خۆى نەڤەرێ يان دوانـى لەگـەڵ بووبێ چۆن بتـوانێ (١٠) كەس هـەڵگرێ، هـەر ئۆتۆمبێلێك هـاتبوو نـەيتوانيبوو خێزانەكـەى ئێمـە ببـات دواتـر فەرمانـدەى فەيلـەق بـە هەليكۆپتـەر بەسـەر ناوچـەكەدا سـوڕابوەوە ئـەو قەرەباڵغيـەى بـينى بـوو، بۆيـە لـە ناوەنـدى ناحيـەى شـوان (ڕێـدار) دابـەزيبوو ليوايـەك مغـاوير يـان فـەوجێكى نـاردبوو ئەوانـەى لـەوێبوون ڕەنگـە ژمارەيـان (١٥٠) كـەس بـووبێ هـەموويانيان دەسـگيركردبوو خێزانەكـەى منـيش لەگـەڵ ئـەوان دەسـگيركران، دواتـر (كوێخـا ئەحمـەد كـە ئەحمـەدى حەمەڕەشـيد) ى پێدەڵێن خەڵكى گوندى (ناڕوجەيە) خـۆى و خوشـكێكى لەگـەڵ دايـك و بـاوك و

خوشــك و براكــانم بەيەكــەوە دەســگيركرابوون، ئــەوان لــە نوگرەســەلمان هاتنەوە،ئەوان شايەتحالَى زيندوون من لەزارى ئەوانەوە هەواڵيانم زانى، دايكم دووگيانبوو، تەنانەت باسى ئەوەشيان بۆمكرد كەدايكم لە كەمپى تۆبزاوەى كەركوك منداڵى بوە، ئەمە قسەى (ئايشە) ى خوشكى (ئەحمەدە) يە وتى (بەديعە) واتە دايكم منداڵى بوو لە تۆبزاوە، ئێستاش ئەو دوو كەسە لەژيان ماوون، بەلاّم ئەوان لە تۆبزاوە لە خێزانەكەى ئێمە دابڕابوون بۆنوگرەسەلمان بردبوويانن، چونكە لە (تۆبزاوە) خەڵكيان لەيەك جيادەكردەوە،ئيتر من هيچ زانياريەكى ترم دەست نەكەوت سەبارەت بەخێزانەكەم،دەردەسەريەكەش بۆمن مايەوە چونكە بەتەنهامامەوە،ئێمە پێشمەگەبووين، خێزانى پێشمەرگەيان دەگرد لەبەرئەوەى كوڕيان پێشمەرگەيە ئێە هەرواتێگەيشتين نەماندەزانى ئەمە ئەنفالەو كوردقڕانە،من لەبەر خاترى ئەوە خۆم رادەستى رژێمكردەوە بۆ ئەوەى ئەوان ڕزگاربكەم وتم بامن ببمە قوربانى نەك خێزانەكەم هەموويان ببنەقوربانى من، بەو قەناعەتە هاتمەوە كە من بێمەوە ئەوان ڕزگاردەبن لەزيندان، بەلاّم نەك هەر ڕزگاريان نەبوو تەنانەت سۆراغيشيانم دەست نەكەوت،دواتر ناوم هاتەوە بۆ سەربازى دەبوو ڕەگەزنامەى ئێراقم هەبوايە بەلاّم نەمبوو دەچووم بۆ دەركردنى ڕەگەزنامە دەيانوت بڕۆ باوكت بێنە منيش دەموت لەبەنديخانەيە دەيانوت بڕۆ نوسراوى پشتگيرى بەنديخانەمان بۆبێنە، منيش نەمدەوێرا بڵێم (ئەنفال) ە چونكە خۆشميان دەسگيردەكرد، بەوشێوەيە مامەوە هەتا ساڵى ١٩٩١ ڕاپەڕين دەستى پێكرد رزگارمانبوو لەڕژێمى بەعس، من لەماڵى مامێكم مامەوە منى گرتە خۆى هەرچەندە هيچ كەس ناتوانىٚ جێگاى باوك و دايك بگرێتەوە، بەلاّم مامم زۆر بۆم باش بوو لێرەوە ڕێز و خۆشەويستيم بۆى هەيە. لەكۆتايدا زۆر سوپاسى (ڕێكخراوى ئەنفالەكانى كوردستان) و (سەنديكاى پارێزەرانى كوردستان لقى هەولێر) دەكەم تاقانەكانيان لەياد نەكردوەو ڕێزلێنانيان بۆ تاقانەكانى ئەنفال كرد، تاكە ڕێكخراون ئێمەلەياد ناكەن،هەروەها لە ڕوى ياساييەوەش ئەم دووڕێكخراوە

هاوكـاری تاقانــەكانی ئــەنفال و خــاوەن قوربانیــانی ئــەنفال دەكــەن،كارێكی زۆرگەورەیان بۆمن كرد بەبێ بەرامبەر لەسەر ئەركی خۆیان، من سێ كەس لەخانەوادەكەم تۆمارنەكرابوو لە خوشك وبراكانم لەنفوس تۆمارنەكرابوون لە داگا كارەكەیان بۆم تەواو كرد لێرەوە رێز و سڵاوم بۆ جەنابت و كاك ئەیاد ئیسماعیل كاكەیی هەیە.

ئەمەی خوارەوەش ناوی ئەندامانی خێزانەكەی كاك ئەحمەدە كە لە تاوانی ئەنفال بێسەروشوێنكران، بەڵام بەداخەوە كاك ئەحمەد ساڵی لەدایكبوونی هەندێكیانی لەبیر نەبوو:

١. محەمەد كەریم فەقێ شەریف ١٩٤٣ باوكی
٢. بەدیعە عەلی كاوێس ١٩٥١ دایكی
٣. سەمەد محەمەد كەریم ١٩٧٣ برای
٤ . ساڵح محەمەد كەریم ١٩٧٥ برای
٥ . ڕابیعە محەمەد كەریم خوشكی
٦. سەباح محەمەد كەریم برای
٧. سەلاحەدین محەمەد برای
٨. سیروان محەمەد كەریم برای
٩ . فەرحان محەمەد كەریم برای
١٠. سەبیحە محەمەد كەریم برای

## سەرنجێك لەسەر چاوپێكەوتنی تاقانەكانی ئەنفال

ئەگەر بەوردی سەرنجی قسەكانی تاقانەكانی ئەنفال بدەین، كۆمەڵێ ڕەهەندی ئابووری وكۆمەڵایەتی ونیشتمانی وتەنانەت یاسایش هتد...... بەدی دەكەین كە گێڕانەوەی بەسەرهاتی هەریەكێكیان خەرمانێك لێكۆڵینەوەو گفتوگۆ هەڵدەگرێت كەلە خوارەوە هەندێكیان پۆلێن دەكین و شرۆڤەیان دەكەین بەكورتی :

## لایەنی ئابووری تاقانەكانی ئەنفال

تاوانی ئەنفال گورزێكی گەورەبوو كە بەر ژێرخانی ئابووری كوردستان و دانیشتوانەكەی كەوت، چونكە گوندنیشینەكان لەماوەی ئەو هەمووساڵەی ژیانیان كە خۆیان و باپیرانیان كۆیان كردبووەوە، لەسەروەت وماڵیان لەڕێی كشتووكاڵ و ئاژەڵداری و پەلەوەرداری، هەموو ئەو هۆكارانەی بووبوونە هۆی بژێوی ژیانیان و خۆشگوزەرانیان، هەمووی لە پەلامارەكانی تاوانی ئەنفال تاڵانكران، لەلایەن سوپای ئێراقی ئەوكات، ئەوەی ماوەش سوتێنراو لەناوبرا و زەوی و زارەكەشیان بێخاوەندمایەوە و ناوچەكانیان كرابە ناوچەی قەدەغەكراو، بەفەرمانی (عەلی حەسەن مەجید) حاكمی ڕەهای ناوچەكە كە فەرمان بەهێزەكانی دەكات، ئەگەر ئاژەڵیشتان بینی لەناوی بەرن، ئەوخێزانانەش كە لەتاوانی ئەنفال شوێنبزر كران بە پێیگێڕانەوەی ڕزگاربووەكان دەڵێن: هەرشتێكمان پێبووبێ و بەهاداربووبێ لێمانیان وەردەگرد وەكو زێڕ و پارە، باشترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە كاتێ گۆڕەبەكۆمەڵەكان هەڵئەدرێنەوە لەگەڵ تەرمەكان هیچ پارەو پارچە زێڕكت بەرچاوناكەوێت، جگە لەهەندێك پێداویستی كەسی وەك تەسبیح و شانە و

موكێش و مەمەی منداڵان و برێك لەناسنامەی پیاوەكان چونكە زۆربەیان ناسنامەكانیشیان لێوەرگیراوەتەوە.

تاقانەكانی ئەنفالیش تەنها بەوجل و بەرگەی بەریانەوە ڕزگاریان بووە، هەندێكیشیان ڕانەمەڕیان پێبووە، بەڵام ئەو مەڕانەش هەربەوە دێنەهەژماردن كەتاڵانكرابن، چونكە بەپارەیەكی زۆركەم خەڵكانی هەلپەرست لێیانكڕیون یانیش سەربازەكان و جاشەكان لێیان ساندوون ، بەمەش تاقانەكانی ئەنفال سەرەڕای ئەوەی بەبێكەسی و بەبێلانە ماونەتەوە، هیچ پارەیەكیان نەبووە بۆ بژێوی ژیانیان، بۆیە لەگەڵ هەڵكشانی تەمەنیان هەوڵی بەدەستهێنانی كارێكیان داوە تا ئەوكاتەی حكومەتی هەرێم موچەی بۆیانبڕیوەتەوە، لەگەڵ دامەزراندنی وەزارەتی كاروباری شەهیدان و ئەنفالكراوەكان لەساڵی ٢٠٠٥ بەدواوە، هەرچەندە ئەو مووچەیەش بەپێی پێداویستی ئەوان نەبووە بەڵام تارادەیەك ژیانیانی گۆڕیوە .

## كێشەكانی باری كەسێتی تاقانەكانی ئەنفال

بەهۆی ئەوەی زۆربەی كۆمەڵگای كوردی، بەتایبەتی لەگوندەكان لەسەردەمی پێش ساڵانی نەوەدەكانی سەدەی رابردو، بۆ ئەوانەی هاوسەرگیریان دەكرد تەنها لای مەلاكان مارەیان دەبڕاوپرۆسەی هاوسەرگیریەكە ئەنجامدەدرا، بۆیە لەتۆماری فەرمانگەی باری كەسی (نفوس) تۆمارناكران،بۆیە زۆربەی ئەو خەڵكانە چەندمنداڵێكیشیان دەبوو، دایك و باوكەكە لەتۆمارەكان هەربە زگورتی دەمانەوەو منداڵەكانیش تۆمارناكران و بەبێ ناسنامەی باریكەسی دەمانەوە، دوای تاوانی ئەنفالیش نەبوونی پێناسەی باری كەسێتی بووە بەربەرستی گەورە لەبەردەم تاقانەكانی ئەنفال، چونكە كەگوندەكان خاپوركران و ژیانیان تیاسڕایەوە، ئەوانەی لەتاوانی ئەنفال رزگاریان بوو لەكۆمەڵگا زۆرەملێكان كۆكرانەوەو لەژێرچاودیری توندی پیاوانی ئەمن و هەواڵگری و سیخورەكانی حكومەت،بۆیە دەبوو هەموو تاكێك

پێناسەی خۆی هەبوایە چونکە بۆ هەرشوێنێك بڕۆیشتیایەی تەنانەت لەماڵی خۆشت داوای ناسنامەت لێدەکرا،ئەوانەی رزگاریان بوو لەتاوانی ئەنفال توانیان بەهەرشێوەیەك بێت خۆیان تۆماربکەن لەفەرمانگەکانی باری کەسی (نفوس) ، بەڵام زۆربەی تاقانەکانی ئەنفال نەیانتوانی ئەم کارەبکەن، جگەلەوەی ئەگەر سەردانی فەرمانگەکانی میرییان بکردایە ئاشکرادەبوون کە تاقانەی ئەنفالن و دەسگیردەکران، لەهەمانکات دایك و باوکیان لەتۆماری فەرمانگەی باری کەسی (نفوس) ەکان تۆمارنەکرابوون، بەمەش هیچ بەڵگەیەك نەبوو بیسەلمێنێ کە کوری ئەودایك و باوکانەن، بۆیە بەناچاری لەلایەن خزم و کەسانی نزیکیان (تبنی) کراون واتە بەناوی خزم و کەسیان تۆمارکراون و بوون بەکوری ئەوان بەفەرمی، تاقانەی ئەنفالیش هەیە ناسنامەی باری کەسی کەسێکی خزمی بەکارهێناوە کەلەژیان نەماوە، وەکو (بورهان حەمەخان غەریب) کەناسنامەی باری کەسی ئامۆزایەکی هەڵگرتبوو کەلەژیان نەمابوو، دوای ساڵی ۱۹۹۱ کە پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجامدابوو، خۆی و هاوسەرومنداڵەکانی هەربەوناوەوە تۆمارکردبوون، بۆیە دوای ئەوەی سەردانی فەرمانگەی باری کەسێتی گەرمیان (نفوس) دەکات یەکسەر دەستگیر دەکرێت و دەخرێتە بەردەم دادگا،هەرچەندە لەگەڵ پارێزەر ئەیادکاکەیی چاودێری کەیسەکەماندەکرد، بەڵام دادگا حوکمی دا بەبەندکردنی، چونکە لەڕووی یاساییەوە ئەم کارە تاوانە، ئەوکات من و پارێزەرئەیادکاکەیی و محسن شێروانی بەرێوەبەری یاسا لەوەزارەتی کاروباری شەهیدان و ئەنفالکراوەکان سەردانمانکرد لە گرتووخانەی سەربازگەی سەلامی سلێمانی و پەیمانمان پێدا هەوڵی بۆبدەین لە حوکمەکەی دەربازی بکەین، دواتر کەیسەکەمان گەیاندە سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و بەرپرسانی ئەوفەرمانگەیەمان تێگەیاند لەڕاستی رووداوەکە،بەرێز مەسعودبارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان فەرمانی لێبوردنی بۆی دەرکردو رزگاری بوو.

کاتێ وەزارەتی کاروباری شەهیدان وئەنفالکراوەکانیش دامەزرا لەساڵی ٢٠٠٥، بۆ برینەوەی موچە و ئەودەستکەوتانەی لەیاسای ئەم وەزارەتە دیاریکرابوو، بۆ وارسی خاوەن قوربانیانی ئەنفال، بەربەستی گەورەی یاسایی کەوتە بەردەم هەموو ئەوانەی (تبنی) کرابوون لەلایەن کەسانی تر، بۆدەستەبەرکردنی موچەو دەستکەوتەکان لە لایەن ئەم وەزارەتەوە بۆ وارسەکان، پێویست بوو بەشێوەی یاسایی پشتڕاستبکرێتەوە کە ئەوان وارسی ژمارەیەکن، تاقانەکانی ئەنفالیش ژمارەیەکیان (تبنی) کرابوون بەناوی خزم و کەسانی نزیك خۆیانەوە،بۆیە ناچاربوون بۆئەوەی بەمافی خۆیان بگەن، بچنە بەردەم دادگا کان بۆ راستکردنەوەی ناوی خۆیان و بخرێنەوە سەردایك وباوکی ڕاستەقینەی خۆیان، کەئێمە لەرێکخراوی ئەنفالەکانی کوردستان دەیان لەوکەیسانەمان ڕاستکردەوە لەدادگاکان بەهاوکاری پارێزەری خۆبەخشی رێکخراومان بەرێز (ئەیاد ئیسماعیل محەمەد کاکەیی) ، کەتاکوئێستاش کێشەی تۆمارکردنی بەشێك لەخێزانەکانیان کە لەتاوانی ئەنفال بزربوون هەرماوەو ئێمەکاری لەسەردەکەین.ئەگەر سەرنجی ڕۆژی لەدایکبوونی تاقانەکانی ئەنفالیش بدەی زۆربەی زۆریان ڕۆژی لەدایکبوونیان ڕۆژی ١/٧، بەمەش ئەوەدەگەیەنێت کەلەدادگاکان تەمەنەکەیان دیاریکراوە،لێرەدا دەگینە ئەوراستیەی کە لەکاتی هاتنەدنیایەوەیان تۆمارنەکراون .

## لایەنی دەرونی تاقانەکانی ئەنفال

دیارە لە هەر شوێنێك شەڕ و ئاشوب هەبێ، ترس و دڵەڕاوکێ لەناو مرۆڤەکان بڵاو دەبێتەوە، گەلی کوردیش بەدرێژایی مێژوو لە ژێرباری ترسی لەناوبردنبووە، بۆیەتاکەکانی کۆمەڵگای کوردستان هەمیشە نیشانەی باری دەرونی ناجێگیر بە ڕوخساریانەوە دیار بووە، بەتایبەتی گوند نشینەکان، بەحوکمی ئەوەی بەردەوام، لەژێر هەڕەشەی پەلاماری فڕۆکەو تانك و هێرشە

سـەربازیەکان بوون،بەتایبـەتی (منـدالآن) . لـەماوەی جێبـەجێکردنی تـاوانی ئـەنفال ئـەم تـرس و دڵەڕاوکێیـە گەیـشتە لوتکـە، چـونکە لـە مـاوەی تـاوانی ئـەنفال، هـەموو جۆرەکـانی چـەك بـەکارهات دژی خـەڵکی مـەدەنی، تەنانـەت چەکە قەدەغـەکراوە نێودەوڵەتیـەکانیش بـەکارهێنرا وەکـو چـەکی کیمیـاوی و بایلۆجۆی، سەرەڕای ڕاوەدوونان و دەسگیرکردنی گوندنشینان هـەموو ئەمانـە بوونەتـە هۆکارێك کـە بـاری دەرونـی خـەڵکی ئـەم ناوچـە پـڕ لەترسـە سـەقامگیر نەبێت.

باری دەرونی تەقانەکانی ئەنفال، لە هەموو خەڵکانی تر ناجیگیر تر بووە، چـونکە سـەرباری ئـەوەی لەناوجەرگـەی پەلاماروتاوانـەکان رزگاریـان بـووە، لەتەمەنێکی مندالیدا لە خێزانـەکانیان دابڕاون و بێسەرپەرشتیار ماونەتـەوە و هـیچ پـشت و پەنایـەکیان نـەبوە، دیـارە خێـزان بـۆ مندالـەکان لـە کۆمـەڵگای کوردی پەنایەکی بەهێز و باوەشێکی گەرمـە و لای منـدالآن شورایەکی بـەهێزە بۆ پاراستنیان لە تـرس و برسێتی و نەخۆشـی و هـەموو ئاستـەنگەکانی ژیـان، لـەناو خێـزانیش دایـك و بـاوك بـۆ مندالـەکان زۆر گرنگـەترە، دوای تـاوانی ئەنفالیش واتە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٨ تـا سـاڵی ١٩٩١ و ڕاپـەڕینی خـەڵکی کوردسـتان، ئـەم تاقانانـە هـەر لـەترس و دڵەڕاوکێـدا گوزەریـاونکردوە، لەبـەر ئـــەوەی هـــەرکاتێك ئاشـــکرابوایەن کـــە بـــەجێماوی ئـــەنفالن راســـتەوخۆ دەسگیردەکران لەلایـەن پیـاوانی حکومـەت، دوای سـاڵی ١٩٩١ یـش بـەهۆی ئـەوەی حکومـەتی ئێـراق ئابڵوقـەی ئـابوری خستە سـەر کوردسـتان بەگشتی، ئەمـەش کاریگـەری زۆری دەرونـی لـەڕووی ئابوریـەوە خـستە سـەر خـەڵکی کوردسـتان بەگشتی و تاقانـەکانی ئـەنفال بەتایەبـەتی، بۆیـە دەبـوو حکومـەتی هەرێمی کوردستان دەیان ناوەندی ڕاهێنانی دەرونی بکردایەوە بۆ تاقانـەکانی ئـەنفال و هـەموو ئەوانـەی لەوتاوانانـە ڕزگاریـان بـووە، چـونکە تـاکو ئێـستاش ئەگـەر بـەوردی سـەرنجی تاقانـەکانی ئـەنفال بـدەین بـەڕونی بـۆت دەردەکـەوێت سـیمایان لـەڕووی دەرونیـەوە نـاجێگیر و مانـدوبونێکی زۆریـان پێـوە دیـارە،

کەمن لە کاتی چاوپێکەوتنەکان و هەڵسوکەوتی بەردەوامم لەگەڵیان بە ڕوونی هەست بەم مەسەلەیەدەکەم، تەنانەت ناجێگیری باری دەرونی تاقانەکانی ئەنفال، کاریگەری خستۆتەسەر منداڵەکانیشیان .

## لایەنی کۆمەڵایەتی تاقانەکانی ئەنفال

لایەنی کۆمەڵایەتیش بەربەستێك بووە لەبەردەم ژیان و گوزەرانی تاقانەکانی ئەنفال، دوای دابڕانیان لەخێزانەکانیان، چونکە لایەنی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگای کوردی زۆر داخراوو چەقبەستووە، هەربۆیەش کەسێك لەدەرەوەی هەرخێزانێك بێتە ناو خێزانێکی تر زۆر ئەستەمە گونجاندنی لە چوارچێوەی ئەو خێزانە، هەرچەندە خزمی یەکیش بن، سەرەڕای ئەوەی دوای تاوانی ئەنفال بەخێوکردنی کەسێك لەڕوی مادیەوە زەحمەت بووە بەهۆی باریدارایی و ئابلۆقەی حکومەتی ناوەندی کە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ژیانی خەڵکەوە لەوسەردەمەدا، بۆیە تاقانەکان ئەگەر شوێنێکیان دەستکەوتبێ بۆ ژیان بەتەنهایی دڵخۆش بوون بۆ ئەوەی نەبنە ئەرك بەسەرکەسانی ترەوە.

تاقانەکانی ئەنفال لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیان زیاتر ڕوبەڕوی کۆسپەکانی بەردەم ژیانیان بوونەتەوەو خۆیان گونجاندووە لەگەڵ تەنهایی و بێنازی دایك وباوك، بۆیە توانیویانە کارێکبکەن بۆ خۆژیاندن و مانەوەیان بەسەربەرزی وەك تاکێکی بەسود بۆ کۆمەڵگاو نیشتمانەکەیان .

تاقانەکانی ئەنفال لەئێستادا بەهەردوو ڕەگەزەوە خێزانیان پێکهیناوەو خاوەند ماڵ و منداڵن و پەیوەندی توندو تۆڵیان لەگەڵ خزم و دۆستانیان هەیە و هەمیشەش سوپاس گوزارن بۆ ئەوکەسانەی هاوکاریانیان کردوون، لەهەمانکات بوون بەمێژووی میللەتی کورد وەکو بەڵگەیەك بۆ پشتڕاستکردنەوەی مەزلومیەتی میللەتی کورد لەچوارچێوەی تاوانی ئەنفال لەباشووری کوردستان.

## لایەنی نیشتمانی تاقانەکانی ئەنفال

گەلی کورد لەئەزەلەوە لایەنی نیشتمانپەروەری بەهێزبووە،چونکە هەمیشە لەژێر زوڵم و ستەم بووە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەم چوارولاتەی کەکوردیان بەسەردا دابەشکراون، لەهەرچوارپارچەکەی کوردستان. تاقانەکانی ئەنفال بەحوکمی ئەوەی لەناوخێزانەکانیان لەماوەی سەرەتای ژیانیان، واتە لەتەمەنی زۆر منداڵی ژیاون،بۆیەهەڵقوڵاوی گیانی شۆڕشگێڕی و نیشتمانپەروەرین، چونکە لادێکان هەمیشە پڕبووە لە رۆحی بەرنگاربوونەوەی دوژمنانی کورد، لادێکان زیاتر لانکەی پێشمەرگایەتی و سیاسەت بوون، دواتریش کە دوژمن هاتووە هەرچی بەها پیرۆز و خۆشەویستەکانی کەهەیانبووە لێی ساندوون وەك و دایك و باوك و خوشك وبراو خزم و ماڵ و سەروەت و سامان و شوێنی لەدایکبوونیان ویادگارەتاڵ و شیرینەکانی زێدی خۆیان، ئەمەش بۆتەهۆی پتەوکردنی رۆحی بەرەنگاربوونەوەو ڕاوەستان بەرانبەر ئەو دەسەڵاتە دیکتاتۆرەی بەعس کە هەمیشە هەوڵی قڕکردن و لەناوبردنی کوردی داوە لەڕابردوودا،لەئیستادا ڕۆحی نیشتمانپەروەری لەناخی تاقانەکانی ئەنفال لەهەرتاکێکی کۆمەڵگای کوردی بەرزترەو هەمیشەش لەهەڵکشاندایە،بۆیە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان زۆربەیان بوونەتە پێشمەگەو لەپرسەنەتەوەییەکان لەڕیزی پێشەوەی جەماوەری کوردستانەوەن.

## لایەنی خوێندەواری تاقانەکانی ئەنفال

بەدرێژایی مێژوو حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی دەوڵەتی ئێراق گرنگیان بەلایەنی خوێندەواری کورد نەداوە، ئەگەر لەناوچەکوردیەکان هەندێ قوتابخانە هەبووبێ ئەویش بۆ ئەوەبووە کە گوایە ڕژێم جیاوازی ناکات لەنێوان نەتەوەکان لەخزمەتکردن،بەڵام لەبنەڕەتدا وانەبووە، چونکە خوێندن بەزمانی کوردی لەژێر فشاری شۆڕشی کورد هەندێجارهەبووە بەتایبەت لە

ڕێکــەوتنی ســاڵی ١٩٧٠ لەگــەڵ شۆڕشــی کورد،بــەڵام دوای تێکــچونی ڕێککەوتننامەکە لەساڵی ١٩٧٤ دیسانەوە خوێندن گۆڕاوە بۆ زمانی عەرەبی، بەمــەش زەرەری گــەورە بــەرقوتابیانی کوردکــەوت چونکە ماوەمــاوە گــۆڕینی زمانی خوێنــدن لــەنێوان دووزمان کاریگــەری زۆری دەبێــت لەســەر فێربــوونی خوێندکار.

جگە لەکورد لەکوردستان نەتەوەی تریش هەن وەکو تورکمان و ئاشوری وهتد... بەڵام هیچ یەکێ لەم نەتەوانە نەیانتوانیوە بەزمانی خۆیان بخوێنن وەك ئەوەی ئێستا لەهەرێمی کوردستان هەیە کە نەتەوەکان بەزمانی خۆیان قوتابخانەیان بۆکراوەتەوەلەسایەی حکومەتی کوردی، دەبوو هەموونەتەوەکان بەزمانی عەرەبی بخوێنن.لەئێراق لەسەردەمی پێش ڕاپەڕینی کورد گرنگی تەنها بەزمانی عەرەبی دەدرابەتایبەتی لەسەردەمی حزبی بەعسی فەرمانڕەوا، لــەماوەی ٣٥ســاڵ حــوکمڕانی خۆیدا،چــونکە ئادیــدۆلۆجیای بــەعس ڕەتکردنەوەی هەموونەتەوەکان بوو،بۆیە حزبی بەعس دەیویست هەمووکات نەتەوەکان لەبۆتەی نەتەوەی عەرەبدا بتوێنێتەوە،خویندنیش بەزمانی عەرەبی کاریگەری زۆری هەبووە لەسەرنەتەوەکان بۆئەوەی شارەزای ئەدەب و زانستێن لەڕێی زمانی عەرەبیەوە، ئەمەش وایدەکرد نەتەوەکان شارەزای ئەدەب و زمــانی خۆیــان نــەبن و گرنگــی زمــانی زکمــاکی خۆیــان لەبیربکــەن، دیارەتاکوئێستاش کاریگەری ئەم لایەنە بەسەر زۆرێك لە خویندەوارانی کوردەوە هەیە بەتایبەتی خەڵکی ئەوناوچانەی کەنزیکن لە ناوچەعەرەبیەکان کە لەئێستادا پێیاندەوترێت ناوچەکوردیەکانی دەرەوەی هەرێمی کوردستان، وەك کەرکوك و شنگال و زمار و خانەقین و شوێنەکانی تر.

تاقانەکانی ئەنفالیش بەحوکمی ئەوەی لەگوندەکانی کوردستان جێنشین بــوون و ئــەو گوندانــەش جێــی بایــەخی حکومــەت نــەبوون لــە ڕووی خزمەتگوزاریەوە، لەسەدا نەوەدیان نەخوێندەوارن، چونکە لە کاتی تاوانی ئەنفال یان تەمەنیان کاتی ئەوەنەبووە بچنەبەرخوێندن،یان لەگوندەکانیان

قوتابخانەنەبووە یانیش لە سەرەتای چونەقوتابخانە بوون، یانیش لە قوتابخانەی سەرتایی بوون تاوانی ئەنفالیان بەسەردا پیادەکراوە، دوای جێبەجێکردنی تاوانی ئەنفال و دابڕانیشیان لەخێزانەکانیان سەرەڕای ئەوەی زۆربەیان بەڵگەی باری کەسێتیان نەبووە، لەهەوڵی ئەوەدابوون پارویەك نانیان دەستکەوێت و پەناگەیەکیان دەستکەوێت لێی بژین، دوای ساڵی ١٩٩١یش زەمینەیەکی لەبار بۆژیانیان نەبووە کەبیر لەخوێندن و چونەقوتبخانەبکەنەوە، لەهەمانکات تەمەنیشیان گەورەبووە، جگەلەکۆمەڵێ بەربەستی تر، هەرچەندە زۆربەیان نەخوێندەوارن، بەڵام لەڕوی رۆشنبیری و قسەکردنەوە لە زۆربەی خوێندەوارەکان رۆشنبیرتر و قسەزانترن .

بەڵام دەبوو حکومەتی هەرێمی کوردستان پرۆژەیەکی تایبەتی هەبوایە بۆئەوەی پەرەبە خوێندنی تاقانەکانی ئەنفال و هەموو ئەوانەی بەهۆی تاوانی ئەنفال و تاوانەکانی تر دژی خەڵکی کوردستان نەیانتوانیوە درێژە بەخوێندن بدەن بۆ ئەوەی ئەوانیش تواناکانی خۆیان بەرجەستەبکەن و ببنە خاوەن بڕوانامە و خزمەتی گەل و نیشتمانەکەیان فراوانتربکەن.

## ( جاش ) سورەی بەرلەشکری ئەنفالچی

جاش ئەو بەناوکوردەیە کە بۆ بەدەستهێنانی بڕێك پارە ئامادەیە هەموو کارێکی شیاو و نەشیاو ئەنجامبدات و خیانەت لە میللەتەکەی خۆی بکات، مەسەلەی خیانەتکاری لەناو هەموو میللەتانی جیهان مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە،ئەگەر سەرنجی ڤێتنامیەکان بدەین لەماوەی بەرنگاربوونەوەیان لەگەڵ ئەمریکا، زۆرترین کەسی بەکرێگیراو و ئەڵقە لەگوێی دوژمنەکەیان هەبووە، بەڵام کاتێك لەشۆرشەکەیان بەسەرکەوتووی دەرچوون، نەیانهێشت ئەوخیانەتکارانە تەنانەت ناوی وڵاتەکەیان بخۆنەوە، میللەتی کوردیش بەدەرنەبووە لە میللەتانی جیهان، لەسەرەتای بزوتنەوەی رزگاری گەلی کورد،لێرەو لەوێ خەڵکانێکی خیانەت کار هەبووە، بەڵام ئەوکەسانە ژمارەیان

کەم بووە و لەسەرئاستی تاك بوون،دیاردەی خیانەتکاری یان جاشایەتی قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵ بزوتنەوە شۆرشگێریەکانی کورد لەدژی دوژمنانی و لەپێناوپاراستنی ناسنامەکەی فراوانتر بووە، لەسەردەمی حوکمرانی رژێمی بەعس دیاردەی جاشایەتی وخیانەتکاری بەشێوەیەکی فراوان گەشەیکردووە،هۆکارەکان زۆرن لێرەدا ناچینەسەرهۆکارەکان چونکە من وەکو کوردێك هیچ هۆکارێك پەسەند ناکەم کە ببێتە بەهانەیەك بۆ ئەوەی چەك دژی گەلەکەی خۆت هەڵبگری،بەتاییبەت بۆ لایەنێك وەك حزبی بەعسی فەرمانڕەوا کە جگە لە ئایدۆلۆجیای حزبکەی خۆی هەموو ئایدیاو نەتەوەو فرەیی و ئازادی و هەموو بەها پیرۆزەکانی مرۆڤایەتی رەت دەکردەوەو تاسەر ئێسقانیش دوژمنداری میللەتەکەت دەکات و پرۆژەی لەناوبردن و توانەوەی دادەرێژێت،

زۆرن بوون ئەوانەی لە پێناو ئاوساندنی ورگی خۆیان و خیزانەکانیان، خیانەتیان بەرامبەر نەتەوەو نیشتمانەکەیان کردووە کە پێیان دەوترێت (جاش) واتە بەچکەی (کەر) کە ئەم ناوە پڕ بەپێستی خیانەتکاریانە.

جاشایەتی بۆخۆی تاوانێکە جێی قبوولکردن نیە، چونکە ئەم تاوانە تەنها بەرامبەر تاکێکی کوردنیە، بەڵکو تاوانێکە بەرامبە هەموو تاکەکان و گەل و نیشتمانە،بۆیە ماف گشتیە بۆ ڕوبەڕو بونەوەیان،ئەگەر کوردستان ولاّتێکبوایە یاسا لێی سەروەربوایە، دەبوو داواکاری گشتی تایەك جاش لەکوردستان بمایە ڕانەوەستایە لە ڕاپێچکردنیان بۆ بەردەم دادگاکان.بۆ ئەوەی ببنە عیبرەت بۆ هەموو ئەوانەی کە لەداهاتوودا بیرلە خیانەتکردن و جاشایەتی دەکەنەوە لەسەرئاستی کوردستانی گەورە.

هەندێ لە سەرۆك جاشەکان باسی ئەوەدەکەن کە بە فەرمانی حزبەکوردستانیەکان بوونەتەجاش،ئەمەش پێموایە درۆیەکی گەورەو بێبنەمایە،چونکە خەڵکی شۆڕشگێر هیچکات هانی هاونیشتمانیانی خۆی نادات بۆ خیانەتکاری و جاشایەتی لەژێر هەر ناوو هۆکارێك،چونکە وەکو

وتمـان جاشايەتی بۆخۆی تاوانـه . رژێمـی بـەعس وداموودەزگاکـانی تایبـەت بەجاش، لە هیچ جاشێکی قبوڵناکرد کە بەبەڵگـەوە تـاوانی بۆ ئـەنجام نـەدات، لەسەرەتاوناوەڕاستی هەشتاکان جاشـەکان دەچوون شـوانەکانیان سـەردەبڕی وکەللەسـەرەکانیان دەبـرد بـۆ ئاغـا عەرەبـە بەعـسیەکانیان دەیـانووت ئەمـە پاسـداری ئێرانیـە، یـان ئەوانـەیان سـەردەبڕی کەنەخۆشـی دەرونیـان هـەبوو چونکە شـوان و ئەوانەی نەخۆشـی دەرونیـان هـەبوو ریـشیان درێـژ بوو، گوایـە تـاقمی سـوپای پاسـدارانی ئێـرانن، ئـەم کـردەوە قێزەوەنـەش لـەپێناو بەدەستهێنانی پارەو پۆستی بەرزی جاشایەتی بوو،نەك هەرئەم تاوانـە بـەڵکو سەدان خەڵکی شۆرشگێروپیاوی قارەمانی ئـەم میللەتـەیان شـەهیدکردوهەزران هاونیشتمانی کوردیان ڕادەستی بەعس کرد.

ئەگەر سەرنجی وتەی تاقانـەکانی ئـەنفال بدەین هـەموویان باسـی (جاش) دەکـەن کـە چ ڕۆڵێکـی خراپیـان هـەبووە لـە دۆزینـەوەی خـەڵکی گونـدەکانی کوردسـتان، لەئەشـکەوت و دۆڵ و حەشـارگەکان و ڕادەسـتکردنیان بـە سـوپای ئەنفالـچی، جاشـەکان جگـە لـە ڕادەسـتکردنی هاونیـشتمانی خۆیـان بەسـوپای ئەنفالـچی تـالأنی گونـدەکانی کوردستانیـشیان کـردووە، ئەگـەر بـەوردی چاوپێکەوتنی تاقانـەکان بخوێنیتـەوە زۆر بـەیان باسـی تاوانـەکانی جاشـەکان دەکەن .

لەئێستادا زۆرێك لـە مـستەشار و سـەرۆك جاشـەکان باسـی ئەوەدەکـەن کـە خـەڵکیان ڕزگـارکردووە لـە پرۆسـەی تـاوانی ئـەنفال، بـەلأم ئەوانـەی چاکەیانکردووە لەو سەردەمە زۆر کەمن ئەوەی کردوشیانە بەقەرزترسان بووە لە شۆرشی کورد و ڕێگایـان بۆ خۆیانخۆشـکردووە گـەر ڕۆژێ لـەڕۆژان شـۆڕش سـەرکەوت بگەڕێنـەوە ناوشـۆڕش، کـە دوای ڕاپـەڕین ئەمـە ڕویـداو ئێـستا هـەموویان بـوون بەپاڵـەوانی گۆڕەپانەکـەو زۆرتـرین سـودیان لەشـۆڕش بینیوە،لەکاتێکا بە بەڵگە پشتراستکراوەتەوە کەتاوانیان ئەنجامداوە،جگـە لـەم بەڵگانـەش زۆرێـك لەجاشـەکان لەهەمبـەر کـورد کوشـتن نیـشانەی ئازایـەتیان

وەگرتــوە لەلایـــەن خـــودی ســـەدامەوە،خەڵکی پێـــشمەرگەوشۆرشگێریش بەدەستی بەتاڵـەوە هەناسـەی سارد هەڵدەکێشن، بـەلاَم ڕاسـتیەك هەیـە دەبـێ هەموولایەك بیزانـێ بەتایبەتی جیلـی داهـاتوو، جـاش لەسـەردەمی جاشـایەتی دەبوو هـەزاران تـاوان و خراپـەکاری بکـات بەرانبـەر میللەتەکـەی، ئینجـا ئەگـەر بـەبێ ئاگـاداری بـەعس چـاکەیەکیان بکردایە،تەنانـەت ئەگـەر کەسـی نزیکـی خۆشیان بکەوتایەتەدەست پیاوانی ڕژێم نەیاندەتوانی هیـچی بۆبکەن،چونکە جاشـایەتی و بەرپرسـیاریەتی لـەڕیزەکانی جاشـەکان لەسـەر تاوانکـاری و ڕوبـەڕو بوونـەوەی نەتەوەکـەی خۆیـان بوونیـات دەنـرا. گـەواهی تاقانـەکانی ئـەنفال و هەمووشـایەتحاڵەکان ئـەم ڕاسـتیە پـشتڕاست دەکەنـەوە لەسـەر تاوانەکانیان.

## ناو و زانیاری تـاقانەکانی ئەنفال

ئـەم خـشتەیەی خـوارە کـەناوی تاقانـەکانی تیـا تۆمارکراوە قوربانیـانی تاوانـەکانی ئـەنفالن، بـۆ دەستنیـشانکردنی ئـەم تاقانانـە پـشتمان بەسـتوە بەزانیاری خۆیان و خەڵکی ناوچەکانیان خۆشیانمان سەرپشککردوە بۆئەوەی خـەڵکانی جگــە لەتاقانــەکان نەخزێنــە نێوانیــان هەرچــەندە ڕەنگــە مــن سەرکەوتوونەبووبم لـەم ئامـارە، دەکرێ تـاك تـاك تیایەهـەبیت کەتاقانـە نەبێت یـان خـەڵکی تـریش هـەبیت تاقانـە بێـت و تۆمارنـەکرابێت بـەلاَم ئەوەنـدەی مـن بەدواداچـــوونم کـــردووە لەسەرتاســـەری کوردســـتان هـــەر ئـــەم ئامـــارەم دەسـتکەوتووەوتۆمارمکردووە بـۆ پاکردنـەوەی تۆمـاری تاقانـەکان پێویـستە پـشت بەیاسـای تاقانـەکان ببەسـترێت وبەڵگەنامـەی زیـاتر لـەڕێی دادگاکانـەوە فەراهەم بکرێت.

خوێنـەری بـەڕێز ژمـارەی قوربانیـەکان کەلـە کۆتـایی خـشتەکە تۆمـارکراوە ئەوە تەنها ژمـارەی قوربانیـانی خێزانـی تاقانەکەیـە لـەدایك و بـاوك و خوشـك و برا جگە لەمانەش تاقانەکان زۆربەیان خزم و کەسی تریـشیان قوربـانی ئەنفالـە وەکو مام و پور و خاڵ و کەسانی تریان .

| ژ | ناوی سیانی تاقانەی ئەنفال | پیشە | ساڵی لەدایکبون | شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا | شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی ئەنفال | ژماردی خیزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | موحسن جەعفەر قادر | ئەفسەر لەوەزارەتی پێشمەرگە | ١٩٧١/١/١ | قەزای کەلار | گوندی وارانی- ئەوجول-خورماتوو | (٩) کەس |
| ٢ | بەختیار محمود کەریم | توێژەری کۆمەلایەتی | ١٩٨٥/١/١ | قەزای کفری | گوندی چەوری- ئەجول-خورماتوو | (٤) کەس |
| ٣ | بەکر مەعروف رۆستەم | کادری حزبی | ١٩٧٦/١/١ | قەزای کەلار | گوندی گامەخەڵ- تیلەکۆ-کەلار | (٥) کەس |
| ٤ | حوسێن عاسی کەریم | پێشمەرگە | ١٩٧٧/١/١ | قەزای کەلار | گوندی وارانی- ئەوجول-خورماتوو | (٨) کەس |
| ٥ | کازم محەمەدئەمین رەسول | کاسب | ١٩٧٨/١/١ | قەزای کەلار | گوندی قەلاًریول- تیلەکۆ-کەلار | (٦) کەس |
| ٦ | عومەر عەلی رەسول | وەفاتی کردوە | ١٩٧٢/١/١ | خۆی وەفاتی کردوەکەسیشی نەماوە | گوندی فەتاح هۆمەر-تیلەکۆ-کەلار | (٩) کەسی ئەنفالە خۆشی لەناوبژی کوژراوە |
| ٧ | هەلکەوت خەسرەو حارس | کاسب | ١٩٧٩/٧/١ | قەزای کەلار | گوندی قەلاًبۆریلە- تیلەکۆ-کەلار | (٦) کەس |
| ٨ | کاوە محەمەدحەمەساڵح | کاسب | ١٩٧٦/٤/٥ | قەزای کەلار | گوندی سەیدبەخان- پیباز-کەلار | (٦) کەس |
| ٩ | جەزا محەمەد رەشید حەمەساڵح | پۆلیس | ١٩٧٤/١/١ | رزگاری- کەلار | گوندی سەیدبەخان- پیباز کەلار | (١٠) کەس |
| ١٠ | رۆستەم عەبدولکەریم عەلی | کاسب | ١٩٧٥/٣/١ | قەزای کفری- گەرمیان | گوندی باوەکر- قادرکەرەم- چەمچەماڵ | (٥) کەس |
| ١١ | غازی عاسی ئەحمەد | وەفاتی کردوە | ١٩٧٠/١/١ | ............... | گوندی عەزیزقادر | (١١) کەس |
| ١٢ | بەکر فەخرەدین ساڵح | کاسب | ١٩٧٦/١/١ | قەزای کەلار | گوندی هۆمەربل- سەرقەلا- کفری | (١٠) کەس |
| ١٣ | ئیبراهیم حەمەسەعید عوسمان | کاسب | ١٩٧٥/٧/١ | کۆمەلگای هەڵبجەی تازە عەربەت- سلێمانی | هەوارمقولە ـ تیلەکۆ ـ کەلار | (٦) کەس |

| ژ | ناوی سیانی ئاقانەی ئەنفال | پیشە | سالی لەدایکبون | شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا | شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خێزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | ئومێد رشید محەممەد | کاسب | ١٩٨٤/٦/٢ | رزگاری/ کەلار | گوندی زنانە - ئەوجول/خورماتوو | (١) کەس دایکی ئەنفالە باوکی پێترشەهیدبووە |
| ١٥ | جوامێر جەبار تاهیر | فەرمانبەر | ١٩٧٢/٧/١ | قەزای کەلار | گوندی فەقێ مستەفا/قادرکەرەم- چەمچەماڵ | (٧) کەس |
| ١٦ | کەژاڵ شوکر محەممەد | کابانی ماڵ | ١٩٧٣/١/١ | قەزای کەلار | گوندی باوەکەر- ناوسپی - کفری | (٨) کەس |
| ١٧ | ئەحمەد علی عەبدولقادر عەلی | پۆلیس | ١٩٧٤/١/١ | قەزای کەلار | گوندی ملەسورە- کەلار | (١٢) کەس |
| ١٨ | محەممەد عەلی عەبدولقادرساڵح | پۆلیس | ١٩٧٢/١/١ | گوندی بنەکە - تیلەکۆ - کەلار | گوندی بنەکە - تیلەکۆ - کەلار | (٦) کەس |
| ١٩ | کاوە رشید حەمەساڵح | کاسب | ١٩٧٢/٧/١ | رزگاری کەلار | گوندی بنەکە- تیلەکۆ-کەلار | (٥) کەس |
| ٢٠ | عەلی حەسەن سابیر | کاسب | ١٩٧٤/١/١ | قەزای کەلار | گوندی زنانەی ژورو- ئەجول - خورماتوو | (٧) کەس |
| ٢١ | عەلی مەجید حەمەجان | کاسب | ١٩٧٤/١/٢٠ | رزگاری کەلار | گوندی بنەکە - تیلەکۆ-کەلار | (٤) کەس |
| ٢٢ | سەعدیە علی رەزا | کابانی ماڵ | ١٩٧٩/٧/١ | گوندی مەسۆیی- سەنگاو- چەمچەماڵ | گوندی مەسۆیی- سەنگاو-چەمچەماڵ | (٦) کەس |
| ٢٣ | عەزیزئیکرام عسمان | پۆلیس | ١٩٨١/٧/١ | رزگاری-کەلار | هەوارەقوڵە- تیلەکۆ-کەلار | (٤) کەس |
| ٢٣ | حوسێن عەبدولاحەمەحەسەن | کاسب | ١٩٧٢/٣/١٥ | گوندی ملەسورە- سەرقەڵا | گوندی ملەسورە- سەرقەڵا | (٦) کەس |
| ٢٤ | تەها رۆستەم محەممەدئەمین | کاسب | ١٩٧٤/١/١ | رزگاری-کەلار | گوندی ملەسورە- سەرقەڵا-کفری | (٦) کەس |
| ٢٥ | ریبوار ناسیح حەمید | کاسب | ١٩٨٣/٧/٣ | قەزای کەلار | گوندی توکن/سەرقەڵا- کفری | (٥) کەس |

| ژ | ناوی سیانی تاقانەی ئەنفال | پیـــشە | سالی لەدایکبون | شوێنی نیشتەجێبوونی نیستا | شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خێزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٥ | کەریم موسا سالح | کاسب | ١٩٦٤/٢/١ | قەزای کەلار | گوندی زنانە - ئەوجول - خورماتوو | (٥) کەس |
| ٢٦ | ئەخشین رۆستەم والی | کابانی ماڵ | ١٩٦٥/١/١ | رزگاری - کەلار | گوندی کانی عوێد - تیلەکۆ - کەلار | (١١) کەس |
| ٢٧ | عومەر ئەحمەد حەسەن | | ١٩٧١ | شەهید | گوندی ئۆمەربل/سەرقەلا - کفری | (٧) کەسینەنفالەخۆشی لە١٩٩١شەهیدبووە |
| ٢٨ | ریبوارمەجید شەریف | | ١٩٧٥/٧/١ | | فەقێ مستەفا - قادرکەرم | (٦) کەسی ئەنفال خۆشی بەکارەساتێک گیانی سپاردووە |
| ٢٩ | ریبوار جەبار رەزا | | ١٩٨٨/١/١ | وەفاتی کردووە | گوندیتوشەلان وارانی خوارو | (٨) کەسی ئەنفالە خۆی وەفاتی کردووە دوومندالی جێماوە |
| ٣٠ | ئەدیب ئەحمەد رۆستەم | پۆلیس | ١٩٦٩/٧/١ | رزگاری-کەلار | گوندی خان | (٣) کەس |
| ٣١ | سالار محەمەد فارس | کاسب | ١٩٨٢/١/١ | گوندی قەلای تەپەروس - شیخ تەویل - کەلار | گوندی قەلای تەپەروس - شیخ تەویل - کەلار | (٢) کەس |
| ٣٢ | عومەر جەمال عەلی | کاسب | ١٩٨٤/٧/١ | سلێمانی | گوندی فەقێ مستەفا - قادرکەرم | (٩) کەس |
| ٣٤ | پەیمان حوسێن حەمەسالح | کابانی ماڵ | ١٩٨٨/١/١ | گوندی کازاری - تانجەرۆ/سلێمانی | گوندی سەیدبێخان - پیباز - کەلار | (٤) کەس |
| ٣٥ | کازم فەتاح محەمەد | کاسب | ١٩٨٢/١/١ | رزگاری-کەلار | گوندی ملەسورە - سەرقەلا - کفری | (٧) کەس |
| ٣٦ | عەبدولهادی عەبدولا محەمەد | کاسب | ١٩٦٥/٧/١ | رزگاری-کەلار | گوندی قولیجان سەرحەد - تیلەکۆ - کەلار | (٦) کەس |
| ٣٧ | جەمال کازم کەمەر | کاسب | ١٩٧٤/٧/١ | رزگار-کەلار | گوندی قەوالی - تیلەکۆ - کەلار | (٨) کەس |
| ٣٨ | مریەم | کابانی ماڵ | ١٩٧٥/٧/١ | قەزای کەلار | گوندی تەپەسەوز- | (٨) کەس |

| ژمارەی خێزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون | شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی ئەنفال | شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا | ساڵی لەدایکبون | پیشە | ناوی سیانی ئاقانەی ئەنفال | ز |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | تیلەکۆ ـ کەلار | | | | ئەحمەدعەبدولا | |
| ( ٨ ) کەس | گوندیگەلاڵ کەوە- باوەنوور کەلار | رزگاری کەلار | ١٩٧٠/٢/١ | کاسب | سالح رۆستەم نامیق | ٣٩ |
| ( ٨ ) کەس | گوندیتەمتەمە/ باوەنوور-کەلار | رزگاری ـ کەلار | ١٩٨١/٣/١ | کاسب | عومەر عەلی رەسول | ٤٠ |
| ( ٤ ) کەس | گوندی قەلاچەرمەلە- تیلەکۆ-کەلار | قەزای کەلار | ١٩٧٢/٧/١ | کاسب | خەلیل عەبدولا ئەحمەد | ٤١ |
| ( ٧ ) کەس | گوندی قەلاچەرمەلە- تیلەکۆ-کەلار | قەزای کەلار | ١٩٨٧/١/١ | کاسب | حەسەن مەحمود ئەحمەد | ٤٢ |
| ( ٤ ) کەس | گوندی سەرکەل- تیلەکۆ-کەلار | قەزای کەلار | ١٩٨١/١/١ | کابانی ماڵ | چیمەن سیامندحەمەرەشید | ٤٣ |
| ( ٩ ) کەس | گوندی کولەجۆ- تیلەکۆ ـ کەلار | رزگاری-کەلار | ١٩٧٨/٧/١ | کاسب | ئازادعەتا حەمەجان | ٤٤ |
| ( ٨ ) کەس | گوندی ملەسورە- سەرقەلا-کفری | رزگاری-کەلار | ١٩٧٤/٧/١ | کاسب | کەماڵ عوسمان مەجید | ٤٥ |
| ( ٩ ) کەس | گوندی عەزیزقادر- سەرقولاکفری | گوندی عەزیزقادر- سەرقەلا-کفری | ١٩٧٤/٧/١ | کاسی | لوقمان مەجید سەعید | ٤٦ |
| ( ٦ ) کەس | گوندی عەزیزقادر- سەرقەلا-کفری | گوندی عەزیزقادر- سەرقەلا-کفری | ١٩٧٥/١/١ | کاسب | عومەر مەحمود فەرەج | ٤٧ |
| ( ٥ ) کەس- لەگۆرەبەکۆمەلەکان رزگاری بووە | گوندی کولەجۆ ـ تیلەکۆ ـ کەلار | رزگاری-کەلار | ١٩٧٦/١/١ | کاسب | تەیمور عەبدولائەحمەد | ٤٨ |
| ( ٩ ) کەس | گوندی توکن | رزگاری-کەلار | ١٩٧١/٧/١ | خانەنشین | بورهان حەمەخان غەریب | ٤٩ |
| ( ٨ ) کەس | گوندی سماق ـ تیلەکۆ ـ کەلار | رزگاری-کەلار | ١٩٧٦/٧/١ | کاسب | کەماڵ خەسرەو رەسول | ٥٠ |
| ( ٩ ) کەس | گوندی عەزیزقادر- سەرقەلاکفری | رزگاری-کەلار | ١٩٧٢/٧/١ | کاسب | بورهان بەکر مەجید | ٥١ |

| ز | ناوی سیانی ئاقانەی ئەنفال | پیشە | سالی لەدایکبون | شوینی نیشتەجیبوونی ئیستا | شوینی نیشتەجیبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خیزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٥٢ | رەحیم تەقی کمەر | کاسب | ١٩٧٤/٧/١ | رزگاری کەلار | گوندی قەوالی- تیلەکوکەلار | (٧) کەس |
| ٥٣ | عەبدولسلام والی فارس | جوتیار | ١٩٦١/٧/١ | رزگاری - کەلار | گوندی سەرمرش - تیلەکو-کەلار | (٢) کەس |
| ٥٤ | محەمەدئەمجەدین رشید | کاسب | ١٩٧٨/٤/١ | رزگاری-کەلار | گوندی تەپەسپی- تیلەکو-کەلار | (٦) کەس |
| ٥٥ | سیروان حەسەن حەمە ئەمین | کاسب | ١٩٧٢/٥/١ | قەزای کفری | گوندی عەلیان- سەرقەلا-کفری | (٨) کەس |
| ٥٦ | ئارەزو محەمەد ئەحمەد | کابانی مال | ١٩٧٩/٧/١ | هەولیر- فەرمانبەران | گوندی دوراجی- ئەوجول-خورماتوو | (٤) کەس |
| ٥٧ | شادان ئەبوبەکر محەمەد | مامۆستا | ١٩٨٢/١/١ | قەزای کەلار | گوندی ئومەبل- سەرقەلا-کفری | (٧) کەس |
| ٥٨ | رەسمیە ئەحمەد کاکی | کابانی مال | ١٩٧٠/٧/١ | قەزای کفری | گوندی بەلەکە- سەرقەلا-کفری | (٢) کەس |
| ٥٩ | پەرین سابیر شوکر | کابانی مال | ١٩٧٦/٦/١ | قەزای کفری | گوندی مەحمودبەگ- | (٩) کەس |
| ٦٠ | ریژاو حوسین ئەحمەد | کابانی مال | ١٩٧٦/٧/١ | سلیمانی- زیرینوك | گوندی مەسوێی- سنگاو-چەمچەمال | (٢) کەسی |
| ٦١ | ئەکبەر رەحمان عەلی | کاسب | ٩٧٤/٧/١ | سلیمانی | گوندی فەقێ مستەفا-قادرکەرەم | (٦) کەس |
| ٦٢ | خالید حوسین عەبدولا | پیشمەرگە | ١٩٧٩/٧/١ | کەرکوك | گوندی فەقێ مستەفا-قادرکەرەم | (٦) کەس |
| ٦٣ | محەمەد حوسین عەزیز | فەرمانبەر | ١٩٧٦/٧/١ | گوندی عەزیزقادر- سەرقەلا-کفری | گوندی عەزیزقادر- سەرقەلا-کفری | (٩) کەس |
| ٦٤ | حەنیفە مەحمود خەلیفە | کابانی مال | ١٩٨٤/١/١ | قەزای سەیدسادق- سلیمانی | گوندی گومەزەرد- تیلەکو-کەلار | (٤) کەس |
| ٦٥ | تەها عەزیز محەمەد | کاسب | ١٩٧٧/٢/٧ | رزگاری-کەلار | گوندی ملەسورە- سەرقەلا-کەلار | (٥) کەس |
| ٦٦ | کامەران فاتح حەمید | کاسب | ١٩٧٦/٧/١٥ | قەزای کفری | گوندی بەلەکە- سەرقەلا-کفری | (٨) |
| ٦٧ | خالید عاسی محەمەد | پۆلیس | ١٩٧٩/١/١ | قەزای کەلار | گوندی گەرمك- | (٥) |

| ژ | ناوی سیانی تاقانەی ئەنفال | پیشە | سالی لەدایکبون | شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا | شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خێزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | ئەوجول - خورماتوو | |
| ٦٨ | مەهابات رەحیم حەمەئەمین | کابانی ماڵ | ١٩٨٢/١/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی هەوارەقوله ـ تیلەکۆ ـ کەلار | (٤) کەس رۆژی لەدایکبونی دایکی بەهەڵەتۆمارکراوە ١٩٨٢ واتەدایکی دووساڵ لەخۆی گەورەترە کەراستەکەی ١٩٦٠ |
| ٦٩ | سیامەند محەمەد قادر | ئەفسەر | ١٩٧٠/١/١ | رزگاری-کەلار | گوندی خان رۆستەم-تیلەکۆ-کەلار | (٩) کەس |
| ٧٠ | حەسەن غەلی فەرەج | کادری حزبی | ١٩٧١/١/١ | قەزای کفری | گوندی ئومەربل/سەرقەلا-کفری | (٨) کەس |
| ٧١ | سەباح ئەحمەدین محەمەد | کاسب | ١٩٧٥/٣/١ | رزگاری-کەلار | گوندی کونکۆتر- تیلەکۆ ـ کەلار | (٨) کەس |
| ٧٢ | وەهاب ئەحمەد محەمەد | ب-ناحیە | ١٩٧٠/٢/١ | کەلار | گوندی وارانی خوارو-ئەوجول-خورماتوو | (٨) کەس |
| ٧٣ | جەمیل محەمەد ئەحمەد | پێشمەرگە | ١٩٧٧/٧/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی فەقێ مستەفا-قادرکەرەم | (٥) کەس |
| ٧٤ | ئیدریس جەمیل حەسەن | کاسب | ١٩٧٧/٧/١ | قەزای چەمەماڵ | گوندی هەرێنە-قادرکەرەم | (١٠) کەس |
| ٧٥ | کارزان جەبار قادر | کاسب | ١٩٨٨/٧/١ | شۆرش-چەمچەماڵ | گوندی تۆپخانە-قادرکەرەم | (٢) کەس |
| ٧٦ | حەیدەر عەسمان محەمەد | کاسب | ١٩٧٨/٧/١ | ناحیەی قادرکەرەم | شۆرش - چەمچەماڵ | (١) کەس |
| ٧٧ | بەرزان حسێن مەمەند | پێمەرگە | ١٩٨١/٧/١ | ناحیەی تەکیە | گوندی سەرچنار-ناغجەلەر-چەمچەماڵ | (٥) کەس |
| ٧٨ | عەتار جەلال کاکە | کاسب | ١٩٧٢/٧/١ | ناحیەی تەکیە | گوندی شێخان-ناغجەلەر | (٤) کەس دایکی پیش ئەنفال لەباوکی جیابۆتەوە واتەماوە |

| ز | ناوی سیانی تاقانەی ئەنفال | پیشە | ساڵی لەدایکبون | شوێنی نیشتەجێبوونی نیستا | شوێنی نیشتەجێبوونی کاتی ئەنفال | ژماردی خێزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٧٩ | عادل مەجید محەمەدئەمین | موختار | ١٩٧٣/٧/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی سەرچنار- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٦) کەس |
| ٨٠ | سەبیحە دارا عەلی | کابانی ماڵ | ١٩٧١/١/٣ | ناحیەی تەکیە- چەمچەماڵ | گوندی سەرچنار- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٩) کەس |
| ٨١ | بێستون خدر عوبێد | کاسب | ١٩٧٢/١/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی توتەقەڵ- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٥) کەس |
| ٨٢ | نارمزو قادر کەریم | کابانی ماڵ | ١٩٨٦/١٠/١٩ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی چوغلیجە- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٤) کەس |
| ٨٣ | ئەحمەد محەمەد ئەحمەد | کاسب | ١٩٦٨/١/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی چوغلیجە- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (١) کەس دایکی پێش ئەنفال وەفاتی کردوە |
| ٨٤ | ئەدیبە کاکەرەش سابیر | کابانی ماڵ | ١٩٨٠/٧/١ | سلێمانی | گوندی جەلەمۆرد- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٩) کەس |
| ٨٥ | لەیلا ئازاد عیبدولا | کابانی ماڵ | ١٩٨٠/٧/١ | کەرکوک | گوندی سەرچنار- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٥) کەس |
| ٨٦ | محەمەد جەمیل رەشید | کاسب | ١٩٧٣/١/١ | گوندی سەرچنار- ناغچەلەر- | گوندی سەرچنار- ناغچەلەر- چەمچەماڵ | (٨) کەس |
| ٨٧ | نازم جەوهەر شەهاب | کاسب | ١٩٧٢/٨/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی شێخان- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٦) کەس |
| ٨٨ | هەژار ئەبوبەکر عەزیز | کاسب | ١٩٨٥/٧/١ | قەزای چەمچەماڵ | گوندی گردخەبەر- ناغجەلەر- چەمچەماڵ | (٥) کەس |
| ٨٩ | ئومید حەسەن سالح | کاسب | ١٩٧٩/٢/١٥ | کۆمەڵگای پیرمەگرون- | گوندی عەسکەر- ناغجەلەر- | (١) کەس |

| ز | ناوی سیانی ئافانەی ئەنفال | پیـــشە | سالی لەدایکبون | شوینی نیشتە جیبوونی ئیستا | شوینی نیشتەجیبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خیزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | قەزای دوکان | چەمچەماڵ | |
| ٩٠ | جومعە نادر عەبدولا | نابینا | ١٩٧٨/٣/١ | ناحیەی تەق تەق-قەزای کۆی | گوندی سماقە- ئاغجەلەر | (٥) کەس لە پێشمەرگایەتی بینداربووە (نابینایە |
| ٩١ | رەمزیە غەفور قادر | کابانی ماڵ | ١٩٧٤/٣/١ | کۆمەڵگای ئاسلوجە- سلێمانی | گوندی گردخەبەر- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٤) کەس |
| ٩٢ | سوهەیلە مستەفا حەمەئەمین | کابانی ماڵ | ١٩٧٠/١/١ | قەزای کۆیە - هەلێر | گوندی گردخەبەر- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٨) کەس |
| ٩٣ | کەژاڵ مەحمود کاکەخان | کابانی ماڵ | ١٩٦٩/٧/١ | ناحیەی عەربەت- سلێمانی | گوندی گردخەبەر- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٦) کەس |
| ٩٤ | سەوزە مەحمود حوسێن | کابانی ماڵ | ١٩٧٠/٧/١ | قەزای کۆیە- هەولێر | گوندی گردخەبەر- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (١٠) کەس |
| ٩٥ | عەدنان جەلال کاکەخان | کاسب | ١٩٧٨/٧/٢٩ | هەولێر | گوندی گردخەبەر- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٦) کەس |
| ٩٦ | مریەم عەبدولا ئەحمەد | کابانی ماڵ | ١٩٧٦/١/١ | تەق تەق- قەزای کۆیە- هەولێر | گوندی گردخەبەر- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٧) |
| ٩٧ | هەوار قادر ئامیق | کابانی ماڵ | ١٩٨٨/١/١ | قەزای کۆیە - هەولێر | گوندی گۆپتەپە - ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٣) کەس |
| ٩٨ | محەمەد جەعفەر ئیسماعیل | کاسب | ١٩٧٨/٧/١ | تەق تەق- قەزای کۆیە هەولێر | گوندی قەسرۆک- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٨) کەس |
| ٩٩ | مەریوان عەبدولقادر سالح | فەرمانبەر | ١٩٧٥/٨/١ | قەزای کۆیە- هەولێر | گوندی قەسرۆک- ئاغجەلەر- چەمچەماڵ | (٩) کەس |
| ١٠٠ | ئاواز شوکر سابیر | کابانی ماڵ | ١٩٦٩/٧/١ | قەزای کۆیە - | گوندی کانی رەش- | (١١) کەس |

| ز | ناوی سیانی تاقانەی ئەنفال | پیشە | سالی لەدایکبون | شوینی نیشتەجیبوونی نیستا | شوینی نیشتەجیبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خیزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | هەولیر | ئاشتی-کویە | |
| ١٠١ | عەدالەت فارس عوسمان | کەمئەندام | ١٩٨٥/٢/٢٠ | گوندی کانی رەش-ئاشتی-کویە-هەلیر | گوندی کانی رەش-ئاشتی-کویە-هەلیر | (٦) کەس. لەکاتی ئەنفال لەنیڤای سەربازی کەوتوتەخوارەوە میشکی تیکچووە |
| ١٠٢ | ئیبراهیم ئەنوەر عەلی | کاسب | ١٩٧٥/٧/١ | قەزای کویە-هەولیر | گوندی گومەشین-ئاشتی-کویە-هەولیر | (٩) کەس |
| ١٠٢ | فەرهاد رەشید ئەمین | کادری حزبی | ١٩٧٧/٧/١ | قەزای خوماتوو | گوندی زینانە-ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٨) کەس |
| ١٠٣ | خالید محەمەد حەسەن | کاسب | ١٩٨٤/١/٢٤ | قەزای خوماتوو | گوندی زینانە-ئەوجول- قەزای خوماتوو | (٤) کەس |
| ١٠٤ | روناك عەزەدین محەمەد | کاسب | ١٩٨٠/٧/١ | قەزای خوماتوو | گوندی زینانەی گەورە-ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٦) کەس |
| ١٠٥ | ئەسعەد حوسین حەسەن | پۆلیس | ١٩٧٣/١/١ | کەرکوك | گوندی عەزیزبەگ-ناحیەی قادرکەرەم | (٩) کەس |
| ١٠٦ | فازل ئەحمەد جەوهەر | کاسب | ١٩٧٥/٧/١ | قەزای خوماتوو | گوندی توکن-تیلەکۆ-کەلار | (٦) کەس |
| ١٠٧ | بەرزان ئەبوبەکر سالح | کاسب | ١٩٧٤/٩/٤ | قەزای خوماتوو | گوندی دوراجی-ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٨) کەس |
| ١٠٨ | ئاکۆ عەزەدین ئیسماعیل | کاسب | ١٩٨٨/١/١ | قەزای خوماتوو | گوندی وارانی بچوك-ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٧) کەس. ئاکۆلەخیزانەکەی دابراوە دواترلە بەغدا دۆزراوەتەوە |
| ١٠٩ | شەلال ئیسماعیل حەمید | کاسب | ١٩٨٢/١/١ | قەزای خوماتوو | گوندی تالاو-ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٤) کەس |

| ژ | ناوی سیانی تاقانەی ئەنفال | پیشە | سالی لەدایکبون | شوینی نیشتەجیبوونی ئیستا | شوینی نیشتەجیبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خیزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١١٠ | خەولە ئەحمەد فاتیح | کابانی ماڵ | ١٩٨٢/٩/٢٥ | قەزای خوماتوو | گوندی قەلا- ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٦) کەی |
| ١١١ | سەلاح خورشید مەجید | کاسب | ١٩٧٧/١/١ | قەزای خوماتوو | گوندی گەرمك- ئەوجول-قەزای خورماتوو | (٧) کەس |
| ١١٢ | خالید حەمەعەزیزحەمەدئەمەین | ئاسایش | ١٩٧٧/١/١ | کۆمەڵگای پیرمەگرون- دوکان | گوندی سیدمر- قەزای دوکان | (٦) کەس |
| ١١٣ | شەوقی حەسەن ئەحمەد | فەرمانبەر | ١٩٧٢/٧/١ | قەزای دوکان- سلێمانی | گوندی مرمنگوێ- سورداش-سلێمانی | (٨) کەس |
| ١١٤ | ئەیوب لەتیف مەحمود | کاسب | ١٩٨٢/١/١ | کۆمەڵگای پیرمەگرون- دوکان- سلێمانی | گوندی سونێ- قەلادزێ-سلێمانی | (٧) کەس |
| ١١٥ | شەماڵ محەمەد سابیر | فەرمانبەر | ١٩٧٩/٧/١ | کۆمەڵگای پیرمەگرون- دوکان- سلێمانی | گوندی سەرمۆرد- سورداش-قەزای دوکان | (٥) کەس |
| ١١٦ | سەعدیە محەمەد مەعروف | کابانی ماڵ | ١٩٧٢/٧/١ | سلێمانی | گوندی سەرکۆ- ناحیەی قەرەداغ- سلێمانی | (٩) کەس |
| ١١٧ | حەسەن مەعروف حەسەن | کاسب | ١٩٧٧/٧/١ | کەرکوك | گوندی هەرگێنە- ناحیەی قادرکەرەم | (٦) کەس |
| ١١٨ | ئەسرەدین خورشید رەشید | کاسب | ١٩٧٠/١١/١ | ناحیەی پردێ- کەرکوك | گوندی هەیەرەسور- ئەوجول- قەزای خورماتوو | (٩) کەس |
| ١١٩ | محەمەد عەلی محەمەدئەمین | کاسب | ١٩٧٤/٨/١ | ناحیەی دەربەندی خان-سلێمانی | هەڵەبجە | (٤) کەس |
| ١٢٠ | ئەحمەد محەمەد کریم | پ ـ م | ١٩٧١/٧/١ | سلێمانی ـ گەرمکی ئاقگە | گوندی ئەرەقە- ناحیەی شوان | (١٠) کەس |

| ژ | ناوی سیانی ئاقانەی ئەنفال | پیشە | سالی لەدایکبون | شوینی نیشتەجیبوونی نیستا | شوینی نیشتەجیبوونی کاتی ئەنفال | ژمارەی خیزانی کە سەرجەمیان ئەنفالکراون |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | کەرکوك | |
| ۱۲۱ | مەنسور وەردە مەخو | فەرمانبەر | ۱۹۷٤/٤/۱۰ | دهۆك ـ گەرمکی سەرهەلدان | دهۆك ـ ئامیدی ـ گوندی درگینی | ( ۸ ) کەس |
| ۱۲۲ | شیبا مەرینە داود | | ۱۹۸۰/۸/۲۷ | دهۆك ـ سێ گرکا | دهۆك ـ ئامیدی ـ گوندی باشێ | ( ۱٤ ) کەس |
| ۱۲۳ | هێلین ئیسماعیل ئەیوب خان | فەرمانبەر | ۱۹۸٥/٤/۸ | دهۆك ـ مالتا | دهۆك ـ ناحیەی مانگیش ـ گوندی ( گوند کۆسە ) | ( ٥ ) کەس |
| ۱۲٤ | دەرواز فایق ئەحمەد | کابانی مال | ۱۹۸۱ | گوندی عەسکەر ـ ناحیەی ئاغجەلەر ـ قەزای چەمچەمال | گوندی عەسکەر ـ ناحیەی ئاغجەلەر ـ قەزای چەمچەمال | ( ٦ ) کەس |
| ۱۲٥ | رەمزیە غەفور فارس | کابانی مال | ۱۹۷٤ | کەرکوك | گوندی قەرەناو ـ ناحیەی شوان ـ کەرکوك | ( ٦ ) کەس |





جل و بەرگ و
پێداویستی
قوربانیەکان لە
دەڤەری گەرمیان –
کفری

( پاش ئەنفال )



مرکز شباب خورماتوو ، شوێنی کۆکردنەوەی قوربانییەکان –
ئەو شوێنەی ( فەرهاد )ی تیا بەند کرابوو لەگەڵ خێزانەکەی



دۆڵی گوندی ( بەڵەگە )ی گەورە لەگەڵ کامەران



ئاکۆ عیزەدین ، لەگەڵ مەجید کوردی و کوڕەکەی



گوندی وارانی ئەو شوێنەی قوربانیەکان خۆیان تیا حەشار دابوو



**له گوندی زینانەوە بەرەو قەزای خورماتوو لەگەل فەرهادی تاقانە**



**گوندی زینانە ، ناوچەی داویە لەگەل فەرهادی تاقانە**



له نێوان گوندی فەقێ مستەفا و سەنگاو لەگەڵ ( جەمیلی تاڤانە )



گوندی ( زینانە ) لەگەڵ ( فەرهاد )ی تاڤانە



**گوندی نۆمەربل**



**لەگەڵ جەمیلی تاقانە لە گوندی فەقێ مستەفاوە بەرەو سەنگاو و چەمچەماڵ**



لەگەڵ جەمیلی تاقانە ، گوندی فەقێ مستەفا ،
ناحیەی قادرکەرەم



لەگەل حەسەنی تاقانە ئەو قورئانەی کە لە باوکی بۆی ماوەتەوە



لەگەل حەسەنی تاقانە لە گوندی ئۆمەرێل



لەگەل حەسەنی تاقانە ئەو کەل و پەلانەی کە لە دایك و باوکی بۆی ماوەتەوە



پێش هەڵاتنی مەریوان باوکی ئەو جزدانەی دەداتێ کە پێنج دینار و ڕوبعێکی تێدابووە، تاکو ئێستا پارێزراوە



لەگەڵ فەرهادی تاقانە ، ئەو دوو بەردەی لەگەڵ خێزانەکەی لە ژێری دەخەون بۆ کۆتایی جار لە دامێنی گوندی سەر شۆراوی داودە



**لەگەڵ شەماڵی تاقانە ، گوندی سەرمۆرد**



**ئەو دەرگایەی کە مەریوان لە مەنزومەی کۆیە لێوەی دەرباز بووە**



**مەنزومەی کۆیە ئەو شوێنەی کە قوربانیەکانی تیدا کۆ کراونەتەوە**



**تاقانەکانی ئەنفال لە هۆڵی ئەوتار – هەولێر کە مەراسیمی ڕێزلێنا نمان بۆیان ڕێکخستبوو**

## تاقانەکانی پارێزگای دهۆك کە (٣) کەسن ، مەسیحین



هێلین ئیسماعیل ئەیوب
وێنەی خێزانە ئەنفالکراوەکەیانی بەدەستەوەیە
کە ژمارەیان (٥) کەسن



شیبا مربینا داود



منصور وردە مخۆ



لەگەڵ تاقانەکانی ئەنفال لە گوندی سفەیەی کاکەیی



لەگەڵ تاقانەکانی ئەنفال لە پەرلەمانی کوردستان



**دامێنی چیای خاڵخاڵان، ئەو دۆڵەی قوربانیەکان خۆیان تیا حەشار دابوو و جاشەکاندۆزیانەوە لەکاتی چاو پێکەوتنم لەگەڵ ( مەریوان عەبدولقادر )**



**گوندی قەسرۆك لەگەڵ مەریوان**



**لەگەڵ حەسەن عەلی فەرەج تاقانەی ئەنفال و وێنەی سەرجەم خێزانەکەی کە ئەنفالکران**



**لەگەڵ ئەحمەد محەمەد کەریم تەرەقەیی تاقانەی ئەنفال و ئەیاد کاکەیی لە دادگای هەولێر**



لەگەڵ ئاکۆی تاقانە لەگوندی وارانی



لەگەڵ تاقانەکانی ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە - هەولێر ،

هۆڵی ئەوتار

﴿ بەناوی خوای بەخشندە و میهرابان ﴾

## ب / سوپاس و پێزانین

دەوەران دەوڵەت لە دەست ئەسێنێ

بەڵام ناوی چاك تا سەر ئەمێنێ

بەرێزان کاك ١- زەمان عەبدە

٢- ئەیاد کاکەیی

سڵاوێکی گەرم

ئەمەوێ لەو ووتەیەی سەرەوە شۆڕ ببمەوە بۆ ناو قوڵایی هەستەکانم ، بەرێزان دەوران دەوڵەت لە دەست ئەسێنێ و هیچ رژێم و دەسەڵاتێك تا سەر دەسەڵاتی نامێنێ گرنگ ئەوەیە مرۆڤەکان کە دەسەڵاتیان هەیە بۆ خزمەتی کۆمەڵگا بە کاری بێنێ زۆرن ئەوانە ناویان لە مێژوودا بە رەشی ئەمێنێ ، بەڵام بەرێزان ئێوە هەر دووکتان بە هۆی هاوکاری و چارەسەرکردنی کێشەی ئەنفالکراوەکانەوە کە خۆبەخش کار ئەکەن ناوتان لە دڵ و دەرونی ئێمەی خانەوادەی ئەنفال کراوەکاندا هەمیشە وەك چرایەکی گەش ئەسوتێ و ئەمێنێ سوپاسی خۆمتان ئاراستەی ئەکەم کە هەموو کێشە یاساییەکانتان بۆم چارەسەر کرد .

لەگەڵ رێزدا ...

صباح نجم الدین

تاقانەی ئەنفال

کەلار / رزگاری / ئەنفالەکان

ژ. م / ٠٧٧٠١٥٥٤٣٦٨